ئەحمەد باوەڕ

# چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی هاوچەرخی كورد







زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە ( ٢٧٩ )

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی


# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هاوچەرخی کورد


بابەت: مێژوویی

نووسینی:ئەحمەد باوەڕ

بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان

هەڵەچنی: ناسك عەزیز

تیراژ: ٨٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ١٦٦ ی ٢٠٠٤








www.sardam.info

پێشکەشە بە:-

ڕۆحی پەپوولەیی و لەگوڵ پاکتری
دایکم زینەت ڕەحیم زەنگەنە

# پێشەكی

بەگوێرەی ئەو ئەزموون و تەجروبە كەمـەی، لە بواری مێـژوودا هەمە، بەتەواوی ئەوەم لا یەكلایی بۆتـەوە كە بەبێ ترس و بەبێ پرس‌و بەبێ شەرم بڵێم: بڕوا ناكەم هیچ نووسین و هەوڵ و لێك دانەوەیەك هێندەی مێژوو حەساس و، پێویستی بەوەستان و پشوو درێژی هـەبێت، سـەرەڕای بایـەخدان‌و حـەق و حیساب كردن بۆ گیانی مەوزوعیەت و ئەمانەتی زانستی.

ئەم كتێبەی منیش (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هاوچەرخی كورد) بەشێكی ئێجگار كـەمی ئـەو باس و نووسینە مێژوویانـەم دەگرنـەوە كە پێشتر لـە ڕێگای گۆڤار و ڕۆژنامە كوردییەكانەوە، لە ساڵانی ڕابووردودا، بڵاوم كردوونەتەوە، بەڕای خۆم تا كاتی گەڵاڵە كردنی ئەم كتێبەش، بایەخی مێژوویی خۆیان لەدەس نەداوە، تەنها ئەوە نەبێ، لێرەدا و، بەپێی پێویست دەسكاریەكی زۆر كەمی بەشێكیانم كردووە، بەڕادەیە، بێ ئەوەی كار لە ناوەڕۆكیان بكا. جگە لەوەش، بەشێكی زۆری باسەكانی ئەم كتێبە، بەڵگەنامەیی‌و، كاری مەیدانین، واتە سەرچاوەی زانیارییان، لە ئەنجامی بەدوادا گەڕان و كاری تا ڕادەیەك ڕۆژانـەی خۆمـەوە كۆكراونەتـەوەو، دووبارە لێرەدا كۆیـان دەكەمـەوە، بـەهیوای ئـەوەی بتـوانم لـە داهـاتوودا ئـەو نووسینانەی تریشم كە لەسەر هەمان تەرز نووسیومن كۆیان بكەمەوەو، پێشكەش بەخوێنەر و نامەخانەی كوردیان بكەم.... سەبارەت بە هەر ڕەخنەیەك‌و سەرنج‌و تێبینی و بەدوادا چوونێكی مەوزوعیانە، هەمیشە خۆم بەقـەرزار دەزانم و دەیـان خەمە بان دڵ و دیدە.

ئەحمەد باوەڕ

٢٠٠٢/١٢/١٢

# باسی یەكەم

## كێشەی مووسڵ وداكۆكی كۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی شاری سلێمانی١٩٢٥

ڕەنگدانەوەی كێشەی مووسڵ وەك قەیرانێكی سیاسی و ئابووری لە ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. لە نێوان وڵاتانی ئیستعماری وەك بەریتانیا، فەرەنسا، ڕووسیا و وولاتەیەكگرتوەكان. زیاتر لە ساڵانی جەنگی یەكەمی جیهانی و دوای جەنگەوە سەری هەڵدا. بەجۆرێ ململانێ و دووبەرەكایەتیەكی گەورەی لە نێوانیادا هێنایەكایەوە. وێڕای ئەوەش كێشەی ویلایەتی موسڵ بۆ ئەو دانیشتوانەش بووبەرەوش و قەیرانێكی گەورە كە لە چوارچێوەی ئەم ویلایەتەی ژێردەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی و ئینتدابی بەریتانی و، حكومەتێك لە دوای یەكەكانی عێراقدایە و تیایدا گیرساونەتەوە. چونكە ئەتوانم بڵێم: ویلایەتی موسڵ یاوەكتر كوردستانی باشووری گرێدراوە بە عێراقەوە بەشێكی گرنگی كوردستانی گەورە و ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە كە تا وەكو ئەمرۆ چارەسەرێكی گونجاو بۆ رەوشن وباردودۆخەكەی نەدۆزراوەتەوە. وەك ئەو زامە وایە كە بەردەوام خوێنی لەبەر بڕوا هەر بەم پێیەش دەتوانین لە چەند تەوەرێكی گرنگەوە

بڕوانینە ئەم کێشەیەو زۆریش لەوەزیاتر هەڵدەگرێ کە تاوەکو ئێستا لە سەری نووسرابێ و بابەتی لەسەر یەکالایی کرابێتەوە. چونکە لەلایەك دەتوانین بڵێین: کێشەیەکی ترسناکی نێودەوڵەتییە. لەبەرئەوەی زۆربەی وڵاتە ئیستیعمارییەکان ماوەیەکی زۆر و ئێستاشی لەگەڵدابێ چاویان لەم ناوچە ستراتیجی و گرنگەی ڕۆژهەلاتە. تالە ڕووی داهاتی ئابوورییەوە واتە نەوت ئەو پشکەی کە دوای جەنگی یەکەم دەستیان کەوت کۆتاییینەیە. هاوکات دەشتوانین بڵێین: کێشەیەکی ناوچەیییە لەبەرئەوەی تا ئێستا تورکیای میراتگری دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی ئەتاتۆرکەوە چاویان تێبڕیوە.([1])

---

ملحق رقم(١)

الجمعية الكردية

المركز العام

عدد٧٩٣

مذكرة مرفوعة

الى مجلس عصبة الامم

في الزمن الذي يدعى مجلس عصبة الامم الى البت في مصير ولاية الموصل نهائيا ترى الجمعية الكردية من واجبها ان توصل لكم صوت تلك البلاد النائية وان كان هذا الصوت ضعيفا لا يسمع في العالم المتمدن.

ان جمعيتنا قامت في وجه الاتراك المطالبين بحاكميتهم على بلاد تحررت اخيرا من مظالمهم ولم تزل قائمة بوجههم فهي لكونها تأسست للدفاع عن منافع القوم الكردي تعارض شديدا مطالب حكومة انقرة في امتلاكها الموصل لان اكثرية سكان هذه الولاية اكراد..

دەشتوانین بڵێین: کێشەیەکی ناو خۆیی نێوان ئەو نەتەوەو کەمینانەیە کە لە مێژەوە لەم چوارچێوەیەدا دەژین ئەمەش وایکردوە کە لە سەرەتای گەلاڵە بوونی ئەم کێشەیەوە دانیشتوانەکەشی بخاتە هەڵوێستی داکۆکی کردنەوە. لەهەر سیاسەتێکی داگیرکردن لەم هەرێمە بە تایبەتی گەلی کورد، بەحوکمی ئەوەی، نەتەوەی کورد، لەم ناوچەیەدا و لە مێژەوە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان پێك هێناوە، وەك لە یادداشتنامەیەکی(کۆمەڵەی کورد)ی ژمارە(٧٩٢)یدا کە بۆ کۆمەڵەی گەلان(نەتەوەکان)ی بەرزکردۆتەوە لە ساڵی(١٩٢٤)دا. سەبارەت بەڕەگەزەکانی ناو ویلایەتی مووسڵ و کێشەی ویلایەتی مووسڵ نووسیویە:"ویلایەتی موسڵ بەگوێرەی ئەو سەر ژمێریانەی کە تورکەکان خۆیان پشتی پێدە بەستێت پێك هاتوە لە ٤٥٠هەزار کورد، ١٨٠هەزار عەرەب، ٦٦هەزار تورك، ٦٥هەزار دیان(نستوری)و١٦هەزار جوولەکە. بەپێی ئەم سەرژمێریەش واڕوون دەبێتەوە. مووسڵ مۆرکێکی کوردانەی هەیە و ڕەگەزی کوردی تیابالادەستە" بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە(٧٩٢)ی ساڵی١٩٢٥ کەلە ئەرشیفی خۆمدا هەیە(ب نووسەر). جگە لەوەی هەموو سەرژمێریە کۆنەکانیش دەلالەت لەوەدەکەن کە موسڵ وویلایەتی موسڵ بەزۆری دانیشتوانەکەی

---

تحتوي ولاية الموصل بحسب الاحصائات التي تعتمد عليها تركية نفسها ٤٥٠الف كردي و١٨٠الف عربي و٦٦الف تركي و٦٥الف نسطوري و١٦الف يهودي ومن هذه الارقام تتضح بصورة جلية صفة الموصل الكردية لان العنصر الكردي فيها يؤلف الاكثرية المطلقة التي يزيد عدد افرادها.

بەشێك لە یادشتنامەی(کۆمەڵەی کورد) کە بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلانی بەرزکردۆتەوە(ئەرشیفی نووسەر ب)

کوردبوون. هەر لەبەرئەوەشە کە کوردان لە کاتێکەوە بەریتانیا بە تەواوی دەستی بەسەر ویلایەتی مووسڵدا گرت. بە تایبەتی پاش ئاگربڕی مۆدرۆس(هدنە مودرس)ی ٣٠ تەشرینی یەکەمی١٩١٨و، ڕازی کردنی فەرەنسیەکان کەدەس لە موسڵ هەلگرن بەپێی ئەوەی کەلەڕێکەوتنامەی نهێنی سایکس-بیکوی ساڵی١٩١٦ی نێوانیاندا بەر فەرەنسا کەوتبوو چونکە حکومەتی بەریتانیا بەرامبەربەوە پاڵپشت و داکۆکیکەری فەرەنسابوو. لەو سیاسەت و داگیرکاریانەی کە فەرنسا دەیویست لە شوێنەجۆر بەجۆرەکانی جیهاندا پراکتیزمیان بکا. بەتایبەتی لە پازدەی ئەیلولی ١٩١٩دا لەوانەش:-

١-فەرەنسا دەستی بەسەر ڕێژمیەك لە نەوتی مووسڵدا بکەوێت. ئەویش بەگوێرەی ڕاست کردنەوەیەك(تعدیل) لەڕێکەوتنامەی ١٥-١٧ای ئایاری١٩١٦.

٢-بەریتانیاو هاوپەیمان و پشتگیریکەری فەرەنسا بێت لە کاتێکدا کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا. هەر داواکاری و ڕەخنەیەکی هەبێ.

٣-هەر کە بڕیار لەسەرمەسەلەی(ئینتداب)درا. ئەوا ئەبێ دیمەشق و حەلەب و ئەسکەندەرۆنە و بەیروت بکەونە ژێر ئینتدابی فەرەنساوە.(ماجد عبدالرضا، المسألة الکردیة، ص٤٧).

لەم ماوەیەش بەدواوە کە عێراق کەوتە ژێردەسەڵاتی بەریتانیاوە و کۆمەڵەی گەلان(عصبة الامم) بە تەواوی دانی بەو مەسەلەیەداناو، ڕایگەیاند کە: ئەبێ عێراق بە گوێرەی سیاسەتی ئینتداب لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بمێنێتەوە. پاشان حکومەتی عێراقیش دوای تاج لە سەرنانی شافەیسەڵی یەکەم لە ٢٣ی ئابی١٩٢١دا. لەسەرهەمان ڕێڕەو و هەمان مەبەست ئەو بۆ چوونەی پەسەند کردوو، بە تەواوی وڵاتی عێراق گرێدرا بە سیاسەتی بەریتانیاو ئەو هەموو ڕێکەوتنامەیەوە کە حکومەتی عێراق لە ساڵی١٩٢٢ەوە تاوەکو

ساڵی(١٩٤٨)لەگەڵیدا مۆری کرد. سەبارەت بە هەڵوێستێکی لەو بابەتەش دانیشتوانی عێرا ق بە عەرەب و کوردیەوە دەستەوەستان نەبوون و، لە ڕووی ئەو سیاسەتە و بۆ چوونەی وولاتانی ئیستیعماریدا وەستان و، داوای سەربەخۆیی عێراقیان دەکرد. بەجۆرێ تەنها لە مووسڵ و شاری سلێمانیدا(٢)حیزب و(٢)کۆمەڵە بۆ مەسەلەی داکۆکی کردن لەسەرکێشەی مووسڵ دامەزران. خۆ ئەگەر هی تریش هەبوو بێت، ئەوا من لێیان بێ ئاگام لەوانە:(حیزبی سەربەخۆیی عێراقی-مووسڵ) لە ئەیلولی١٩٢٤داو، پاشان:(حیزبی نیشتمانی عێراقی-مووسڵ) لە ئایاری١٩٢٥دا. سەرەڕای(کۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی-مووسڵ)لە٢٦/١/١٩٢٥دا. ئەمانە بە تەواوی داکۆکی ئەوەیان دەکرد کەویلایەتی مووسڵ نەبێ وەك کێشەیەکی زیندوو سەیربکرێ و نابێ بە هیچ جۆرێ ولاتانی ئیستعماری بیرلەوە بکەنەوە کە مووسڵ لە کۆتاییدا ئەبێتە شوێنێکی داگیر کراوو بۆ خزمەتی بەرژەوەندیەکانیان بە کاریان ئەهێنێت لە شاری سلێمانیشەوە، بۆ هەمان مەبەست وەك عبدالرزاق الحسنی و فاروق صالح العمر جەختی لەسەردەکەنەوە(کۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی-جمعیەالدفاع الوطنی) لە شاری سلێمانی دامەزراوە وەك ئەوەی بەپێی ڕۆژنامەی (ژیانەوە)ی ئەوکاتە کە بەزمانی کوردی دەرچووە لە ژمارەی ڕۆژی١٩/٢/١٩٢٥یدا هەواڵێك لە بارەی کۆمەڵەی ناوبراوەوە بلاوکراوەتەوە کەوا دانیشتوانی شاری سلێمانی بە بازرگان و پیاوانی ناودار و ڕووناکبیرو، توێژەکانی تریەوە(کۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی)(احلام حسین، الأفکار السیاسیة،١٩٨٥،ص٤٩) یان پێك هێناوە. بۆ داکۆکی کردن لە نیشتمانەکەیان بەرامبەر بە لیژنەی سنوور و بۆ پاراستنی ولاتەکەیان لە کۆیلەیەتیی تورکان. لە پەیڕەوی کۆمەڵەکەشدا وا هاتووە کە ئامانجی کۆمەڵە داکۆکی کردنە لە نیشتمانو سنووری ئێستای و یلایەتی

مووسڵ بە عێراقەوە هەر کەسێکیش لە ئەندامانی کۆمەڵەکەش واخۆی ئەناسێتەوە کە کوردە و عیراقیەو، وڵاتو نیشتمانەکەشی بەویلایەتی مووسڵەوە بەشێکی دانەبڕاوە لە وڵاتی عیراق. جگەلەوە الحسنی والعمر بە گوێرەی ڕۆژنامەی(ژیانەوە) ئیتر نازانم چۆن کردوویانە بە عەرەبی و لەکێوە وەریانگرتوە(اب نووسەر) ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ناوبراویان وادەسنیشان کردوە کە بریتی بوون لەم کەسایەتیانە:-

١-ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ
٢-ڕەشید مستی ئەفەندی
٣-تۆفیق بەگی مەحمود ئاغا
٤-مەحمەد ئاغای ئەورەحمان ئاغا
٥-شێخ مەحمەد گولانی
٦-عزەت بەگی عوسمان پاشا
٧-عەلی عرفان ئەفەندی
٨-حاجی سەعید ئاغا
٩-ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ
١٠-مەحمەد بەگی قادر پاشا
١١-تۆفیق قەزاز
١٢-مەحمەد بەگی حاجی ڕەسوڵ بەگ
١٣-مەحمەد ئەفەندی(سەرۆکی شارەوانی)
١٤-فەتاح ئەفەندی ئەوقاف
١٥-فائق بەگی مەعروف بەگ
١٦-شەوکەت بەگی عزەت بەگ[٢]

---

٢ئەم باسە لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٢٠٠)ی، ١٩٩٦/١/٢٦دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی دووەم

## کۆماری مەنگۆلیاو مەسەلەی کورد لە ڕێکخراوی نێودەوڵەتیدا

لەگەڵ بەرپا بوونی جەنگی دووەمی جیهانیداو، لە درێژەی ساڵانی جەنگیشدا(١٩٣٩-١٩٤٥) وڵاتە هاوپەیمانەکان کەوتنەئەوەی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بۆ دوای جەنگ دامەزرێنن. بە مەرجێ ئەم ڕێکخراوە جێگای ڕێکخراوی یەکەمی واتە(کۆمەڵەی گەلان-عصبة الأمم) نەگرێتەوە. بەڵکو ڕێکخراوێك بێ تایبەتمەندی و ڕۆڵێکی کاریگەری نێودەوڵەتی ئەوتۆی هەبێ کە لە داوڕۆژدا هەموو ئەو وڵاتانەی کە تیایدا دەبنە ئەندام، خاوەنی سەرداری خۆیان و ڕێز لە هەموو بنەماو ئەو یاسانێودەوڵەتیانە بگرن کە لەلایەن ئەم دەزگا نێودەوڵەتییەوە دەردەچێ و، دەستوور و بنەما سەرەکیەکانی ئەم ڕێکخراوە دیاریان دەکا. بۆ ئەم مەبەستەش دوای چەندین دانیشتن و کۆبوونەوەی بەردەوام لە نێوان وڵاتەگەورەکانی وەك: بەریتانیا، فەرەنسا، ئەمەریکا، چینی میللی، یەکێتی سۆڤێت و دوای وڵاتانیتردا کرا تا لە دواسات و لە ٢٥ی نیسانی١٩٤٥دا بەیاننامەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بڵاوکرایەوەو، نزیکەی(٥١)پەنجاویەك وڵاتی ئەوکاتەی

جیهان ئیمزایان لەسەرئەم ڕاگەیانراوە جیهانییەکرد بەجۆرێك کەیاسایەکی نێودەوڵەتی بۆ جیهان و سیاسەتی دوای جەنگ داڕێژێ. هەر لەم کاتەشدا پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانیش هەوڵی ئەوەیاندا کە مافەکانی کورد و داکۆکی کردن لەگەڵ کورد لەو دانیشتنانەدا باسی لێوەبکرێ و ڕێگەچارەی گونجاو بۆ کێشەکەی بدۆزرێتەوە. هەوڵی ئەوەشیان داوە کە یادداشتنامەیەکی ئەوتۆ بۆ ئەو کۆنگرە جیهانییە بەرزبکەنەوە کەتیایدا باسیان لە(سەربەخۆیی و کوردستانێکی ئازاد) کردوە. وەك نیکیتین لە کتێبەکەیدا(الأکراد) نووسیویە: لە کاتی دانیشتنەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا لە شاری سان‌فرانسیسکۆی سەربە ویلایەتی کالیفۆرنیای وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا:(لیژنەیەکی کوردی توانیویەتی لە کاتێکی گونجاودا فرسەتی ئەوە بەدەس بهێنێ و وتار و یاداشتنامەیەك بۆ ئەنجوومەنی کۆنگرەکە بەرزبکاتەوە لەگەڵ وەپێشخستنی نەخشەیەکدا کە داواکاریەکانی خۆی لە کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆدا خستبوەپێشچاو). تەنانەت لە یادداشتنامەکەشیاندا وایان باسکردووە:(ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەر قەرار نابێ تاوەکو چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد نەکرێ(الأکراد،ص١٩٠) هەر لەم سەرو بەندەشدا هاو پەیمانێتی کورد(التحالف الکردي) چەند یاد داشتنامەیەکیان لەم بارەیەوە داوەتە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە دانیشتنەکانی سان‌فرانسیسکۆداو، بەتەواوی باسیان لە بارودۆخی کوردستان و هەلو مەرجی ناوچەکەو ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کردووە.

یەکێك لەو یادداشتنامانەش سەرۆکی بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەو کاتەی کورد(ئیحسان نوری پاشا) لە٢٠/٣/١٩٤٥ەوە بە ناوی هاوپەیمانی کوردەوە، بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانی بەرزکرۆتەوەو تیایدا باسی لە چۆنێتی

دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی کـردوە بـۆ چارەنووسـی(٩)ملیون کورد، لەوکاتـەی کوردستاندا کە پێشتر لە پەیمانی سیڤەری نێودەوڵەتیدا دان بـە مافەکانیاندا نراوە. دیارە هەنگاوگەلێکی لەم بابەتەش بەزۆری دەتوانـین وەك هـەوڵدانێکی کورد و بزوتنەوەی دیبلۆماسی و سیاسی کورد باسـی لێوەبکـەین. دوای ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی سەبارەت بە مافی چارەنووسی کورد لە کوردستانداو، چۆنێتـی گەیشـتنی دەنگـی ڕەوای گـەلی کـورد بـۆ بـەردەم ئـەندامان و دامەزرێنەرانی ڕێکخراوێکی جیهانی کە بـەخۆی لـە بنـەماو ڕێساکانی داب بە ڕاشکاوی یەوە باسی لە(سەربەخۆیی و مافی گەلان) دەکا لە چوارچێوەی مافی چارەی خۆ نووسیندا بـە چەندسـاڵێك دوای دامـەزراندنی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان و، دوای ئـەوەی کێشـەی کـورد لەلایـەن ڕێکخـراوی نێودەوڵەتییەوە. هەنگاوێکی ئەوتۆی بۆنەنرا، کە دەستەبەرێك بـۆ کێشـەکەی بکـا. لـە مـانگی حوزەیرانـی سـاڵی١٩٦٣دا، وڵاتێکـی وەك کۆمـاری گـەلی مـەنگولیا(منغولیـا) داوای لـە(ئوثـانت)ی سـەرۆکی ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتوەکان کرد کە ئەویش بۆخۆی کەسایەتیەکی(بۆرمی)بوو. لەو کاتـەدا و سـەرۆکایەتی ئـەم ڕێکخـراوە جیهانییـەی پـێ سپێردرا بـوو کـە داوا بکـا:(ئـەو سیاسەتی جینۆسایدەی دەوڵەتی عـێراق لـە دژی گەلی کورد گرتوویەتیەبـەر) بخاتـە فایلـەکانی کـاری کۆبوونـەوەکانی کۆمیتـەی(جمعیـة) گشـتی ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە. ئەمەش لەو کاتەدا ڕوویدا کە بۆ چەند مانگێك بـوو حزبی بەعس لە شوباتی ١٩٦٣داو، لە وڵاتی عێراقدا بۆ جاری یەکـەم کۆتاییـان بە دەسەڵاتی عبدولکریم قاسم هێنابوو و، کاروبـاری عێراقیـان گرتبـووە دەس هەرلەم کاتەشدا بوو کە شوعیەکانی عێراق تووشـی ڕاوەدوونـان و کوشـتارێکی گەورەبوون لەلایەن(حرس قومی)یەکانی عێراقەوە.

بەپێی ئەوەش کە درك کینان باسی لێوەدەکا:(لە ٩ی حوزەیراندا ئەندرێ گرۆمیکۆی وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤێت نارەزایی ڕەسمی دەوڵەتی سۆڤێتی لە دژی ئەم شەڕە دایە بالۆێزی عێراق لە مۆسکۆ گۆڤاری(پەیڤین، ژمارە(٤)، ل٩٠) لەپاش دوو رۆژ نوێنەری یەکێتی سۆڤێت لەنەتەوە یەکگرتوەکاندا پێشنیاری کرد:(سیاسەتی جینۆسایدی عێراق بخاتە فایلی کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنەوە) بەڵام وڵاتانی تری ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەوانەیان کە مافی بەکارهێنانی(ڤیتۆ)واتە(نقض)یان هەبوو. ئەم داواکاریەیان ڕەتکردەوە. هەرچەندە دوا بەدوای ئەوە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە ڕێگەی نوێنەرەکەیەوە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هەندێ تەبریراتی بۆ ڕازی کردنی سۆڤێت هێنایەوە سەرەڕای ئەوەش کۆماری گەلی مەنگۆلیا لە١٩٦٣/٨/١٧ دا وبەپشتیوانی یەکێتی سۆڤێت(دووبارە)داواکاریەکەی خۆی لای ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان(UN) سەبارەت بەکورد و سیاسەتی جینۆسایدی دژی کوردکێشایەوە و لە داواکاری پێشووی پاشگەزبوەوە.[٢]

---

٢ئەم باسە لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٩٣٧)،١٩٩٩/٨/١٧،بڵاوکراوەتەوە.

# باسی سێیەم

## مەلیك مەحمود
## لە حوکمڕانیەکەی دەسەڵاتی دووەمیدا

لەو ڕۆژانەوە کە دەسەڵاتدارانی بەریتانیا بە بەردەوامی نێوانیان لەگەڵ مەلیك مەحمود(١٨٨٤-١٩٥٦)دا لە کەنارگیری و تێکچوون دابوو، لەسەردەمی حوکمداریەتی یەکەمیدا بەهۆی ئەوەی کە گوایە شێخ مەحمود دەیەوێ حوکمداریەتێکی کوردی سەربەخۆ و دوور لە دەسەڵاتی بەریتانیا پێك بهێنێ لە کوردستاندا، هاوکات ڕێگاش بۆ ئەوە خۆشدەکات کەتورکەکان بوونیان لە ناوچەکەدا هەبێت، ئەمەش بەتەواوی لەوکاتەوە سەری هەڵدا کە(میجەر نوئێل) ڕاوێژکاری مەدەنی شێخ مەحمود لەکارخراو دەسەڵات کەوتە دەستی(مێجەرسۆن)ەوە. سۆنیش بۆ خۆی ئەوپەڕی دوژمنی سەرسەختی شێخ مەحمود و تێکدەری حوکمڕانیەکەی بوو بەجۆرێ هەر لە هەنگاوی یەکەمی‌یەوە کەوتە دژایەتی کردنی شێخ و کەم کردنەوەی دەسەڵاتی لە شاری سلێمانی و دەوروبەریدا، بۆ بەر پەرچدانەوەی ئەو هەڵوێستەش شێخ مەحمود داوای لە(مەحمودخانی دزلی)کرد بەمەبەستی زیارەت کردنی مەرقەدی کاك ئەحمەدی شێخ بێتە شاری سلێمانیەوە،

ئەویش بەنزیکەی(٣٠٠)سوارەوە دابەزیە شارەوە و بەتەواوی کەوتە دەس سوارە و هێزی کوردەوە سۆنیش لە تاوا هەڵهات و خۆی گەیاندە کەرکوك و دەسەلاتیان کۆتایی هات. ئەوەشیان مابووەوە لە دەبۆکەی شار بەندگران. دیاردەیەکی ئەوتۆش بە تەواوی(ویلسن)ی حاکمی گشتی بەغدا و ئینگلیزەکانی سەغلەت کرد بۆیە کەوتە ئەوەی هەرچی زوترە و ڕاستەوخۆ دەس بگرنەوە بە سەر ناوچەکەدا. سەرەتا کەوتنە ئەوەی لە ڕێگای فڕۆکەوە گەلێك بەیاننامەیان بۆ خەڵکی شاری سلێمانی و شێخ مەحمود نارد و، داوای چۆڵبونیان لێدەکرد سەرەڕای کۆکردنەوەی هێزێکی سەربازی زۆر لە کەرکوکەوە بۆ دەوروبەری تاسڵوجەو دەربەندی بازیان، سوارەی کوردیش بە ڕابەڕایەتی شێخ مەحمود کەوتنە خۆ ئامادە کردن بۆ بەرپەرچ دانەوەی هەر هێرشێك کە لەلایەن ئینگلیزەوە بکرێتە سەرشاری سلێمانی وەك ئەوەی لە ١٨ای حوزیرانی١٩١٩دا شەڕی دەربەندی بازیانی بەناو بانگ ڕوویدا و دوای بەرگرییەکی زۆری هێزەکانی کورد و بەچاوساغی هەندێ کەسی ئەڵقە لە گوێی کورد بۆ ئینگلیزەکان و بەزەبری هێز توانیان لەم شەڕەدا سەربکەون. تەنانەت شێخ مەحمود خۆشی لەم شەڕەدا بە زامداری دەستگیرکرا و لەگەڵ شێخ مەحمەد غەریبی زاوایدا درایە دادگایەکی سەربازی بەریتانی لە شاری بەغدا. لەوێش چەند کەسایەتیەکی تری(کورد؟!) بەرەی خۆیان بۆ خستە مزگەوتەوە لای ئینگلیزەکان و شایەتیان لەسەردا. پاش ئەو دادگایی کردنە کە هەرچەندە حوکمی لەسێدارەدانی درابوو، بەلام دوایی گۆڕییان بە دورخستنەوەی بۆ دورگەی(هنجام-ئەندامان)ی ولاتی هیند، پاشان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دووبارە حوکمی ئینگلیزەکان و، فەرمانڕەوایەتی(میجەرسۆن) دەستی پێ کردەوە و، ماوەی دووساڵی خایاند واتە لە ساڵی ١٩١٩-١٩٢١ بەلام سۆن لەگەڵ

ئـەوەی کەسـایەتیەکی توندوتیژبـوو لەگـەڵ دانیشـتوانداو بـە هێـوری نەدەجوڵایەوە شان بەشانی ئەوەش گەلێك هەنگاو و چاكسازی ئەوتۆی كرد لـە سلێمانی و دەوروبـەریدا بـە جۆرێـك كـە مایـەی سـەرنج بـوو كـە وەك لایەنێكی ئیجابی لـە قەڵەم بدرێـن بۆ نموونـە هەر لەودەمانـەدا هـەوڵێكی زۆری دا بـۆ ئـەوەی بایـەخێكی گـەورە بـدات بـە ڕێگاوبـان و كردنـەوەی قوتابخانە لە شاری سلێمانیدا و دەركردنی هەفتەنامەیەك بە زمـانی كـوردی و بەناوی(پێشكەوتن)ەوە كە بەسەر یەكەوە و تارۆژی وەستانی(١١٨)ژمـارەی لێبلاوكرایـەوە، پاشـان هێنـانی چاپخانەیـەك كـە بـۆ كاروبـاری چاپەمـەنی بـەكاردەهێنرا، سـەرەڕای پێـك هێنـانی ئەنجومـەنی شـارەوانی لـە شـاری سلێمانیدا كە لە كەسانی ناودار و شارەزای ئەودەمەی شارپێكیهێنان. لەگەڵ ئەمانەشدا كۆمەڵێك كاری سەلبی و خراپی لەدوا بەجێما كەبەهیچ جۆرێك لەگەڵ هەل ومەرج و بـارودۆخی كۆمەڵایـەتی ئەوكاتـەی كوردسـتان وشـاردا نەدەگونجا؟! هەر لەم كاتەداو لەسەردەمی دەسـەڵاتی(سۆن)و دواتـر (مێجـەر گولـد)دا ڕۆژ بـەڕۆژ شـیرازەی شـاری سلێمانی و دەوروبـەری لـە تێكچـوون و ئـاڵۆزبووندا بـوو بەهۆی ئـەوەی كۆمـەڵێك داواكـاری وفشـاری جـەماوەری لەسـەرئەوەبوو كـە دەبێـت جـارێكی تـر شـێخ مـەحمود لـە (دیلـی و دووورخستنـەوە)ڕزگاربكرێ و تەنانەت ئەو ڕاپەڕینـە جەماوەریانـەش كەلـە شارو شارۆچكەكانی تری كوردستانی پێكەوە گرێدراوی عێراقدا گەڵاڵـەبوون بـە تـەواوی جـەختیان لەسەرئەم لایەنـەدەكردەوە. شـان بـە شـانی ئـەوەش توركەكان و(ئۆزدەمیر-عەلی شەفیق) پاشا بە تـەواوی بوونیـان لـە ڕەوانـدز و دەورو بـەریدا زیـادی كردبـوو گـەلێك لایـەنگیرو دووكـەوتیان پێكـهێنابوو. ئەمـەش مەترسیەكی گـەورەی لەسـەر سیاسـەتی بـەریتانی لـە كوردسـتان و ناوچەكەدا هێنابووەكایەوە بە شـێوەیەكی ئـەوتۆ بـیر لەوەبكەنەوەكە دەبـێ

چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەم لایەنە بدۆزرێتەوە. شێخ مەحمودیش وەك داواکاریەکی گشتی خەڵك و وەك دەرمانێك بوو بۆ چارەسەری ئەوکێشانە کە بگەڕێتەوە کوردستان ئەوەبوو لە تەموزی ساڵی ١٩٢٢دا، هەفتەنامەی(پێشکەوتن) وەستاو لەم سەروبەندەشدا وا لەناوجەماوەردابڵاوبۆوە شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە کوردستان و، لە ٢١ی تەموزی هەمان ساڵدا(جەمعیەتی کوردستان) بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشای یاملکی دامەزراو، دوابەدوای ئەوەش یەکەم هەفتەنامەی(بانگی کوردستان، کە سەرەتا زمانحاڵی(جەمعیەتی کوردستان) بوو لە ٢ی ئابی١٩٢٢ەوە یەکەمین ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە. لە سەرەتاکانی ئەیلولی هەمان ساڵدا تەنانەت(گۆڵدسیمث) ی جێنشینی(سۆن) ئەوەی بڵاوکردەوە کە جارێکی دی شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە کوردستان و خۆشیان کەوتنە چۆڵ کردنی شار و کاروباری ئیداری شارەکەیان دا بەدەستی ئەنجومەنێکەوە کە لەو دەمانەدا(شێخ قادری حەفید)بەڕێوەی دەبرد.

شێخ مەحمودیش لە کاتی گەڕانەوەیدا لە کوێتەوە بۆ بەغدا سەرەتا چاوی بەنوێنەری(مەندوب)ی باڵای بەریتانی لە عێراق و شافەیسەڵ کەوت، لەوێوە بەرەوکفری و پاشان گەیشتەوە شاری سلێمانی، جگەلەوەش گەلێ سەرچاوەش باس لەوەدەکەن کەلەم جارەشیاندا(مێجەر نۆئێل) لەگەڵیدا گەڕاوەتەوە سلێمانی و ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە، دوا بەدوای ئەوە کە شێخ مەحمود لە ١٢ای ئەیلولی١٩٢٢دا کرا بەشای کوردستان و ئاڵای کوردستان لە شاری سلێمانیدا بەرزکرایەوە. پاش دوو ڕۆژ بەسەر تێپەڕبوونی ئەو بڵاوکردنەوەیەدا و، لە کۆنگرەیەکی جەماوەریدا بە تەواوی متمانەی پاشایەتی کوردستانی پێ سپێردرا، لێرەبەدواوە کەوتە ئەوەی حوکمدار یەتێکی نوێ بۆ کوردستان لە دەستەیەك کە سایەتی و پیاوانی ناوداری

ئەوڕۆژانەی سلێمانی و كوردستان دەستنیشان بكرێ، وەك ئەوەی دواتر یەكەم دەستەی وەزاری حكومەتی كورد لە ١٩٢٢/١٠/١٠داو لەم كە سایەتیانەی كوردستانی ئەوكات پێك هات:-

١-سوپا سالار شێخ قادری حەفید

٢-وەزیری ناوخۆ شێخ مەحمەد غەریب

٣-وەزیری بەرگری سەرهەنگ سالح زەكی ساحێبقران

٤-وەزیری دارایی عەبدول كەریمی عەلەكە

٥-وەزیری فەرهەنگ میرلیوا مستەفا پاشای یامولكی

٦-وەزیری گومرگ ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ

٧-وەزیری نافیعە مەحمەد ئاغای ئەوڕەحمان ئاغا

٨-سەرۆكی ئاسایشی گشتی سەید ئەحمەدی بەرزنجی

٩-پشكنەری گشتی هێزی كوردستان میرلیوا سدیق قادری پاشا

بۆ یەكەم جاریش ناوی زۆربەی زۆری ئەم لیستە وەزارییە لە ژمارە(١٠)ی (بانگی كوردستان) كە لە١٥ی تشرینی یەكەمی ١٩٢٢دا دەرچووە بڵاوكراوەتەوە، هەر چەندە وەزیری داد پەروەری وەك لە ڕیزی ناوەكاندا ناوی بە(شرع و عدل) هاتووە، ماوەیەك بە بەتاڵی مایەوە و، دواتر حاجی مەلا سەعیدی بۆ دانراوە و، شاری سلێمانی بوە بە پایتەختی حكومەتی كوردستان(بانگی كوردستان)یش بووە بە زمانحاڵی ئەم حكومەتە وێرای ئەوەی چەند هەفتەنامە وبڵاوكراوەیەكی تری وەك:(ڕۆژی كوردستان، ئومێدی ئیستقلال) بڵاوكراونەتەوە، بەزۆریش لە چاپخانەی حكومەتی كوردستاندا بەچاپ دەگەیەنران. جا هەر چەندە بە هاری تەمەنی حكومەتی دووەمی شێخ مەحمود لەوەی یەكەم زیاتر و هاوكات چاكسازی و

تورك و ئەوتەوەرانەی بەلای بەریتانیاوە جێگای قەڵسی و ناڕەزایی بوو بەدەرنەبوو، سەرەڕای هەوڵدان و خۆ نزیك كردنەوەی ئۆزدەمیر لە شێخ مەحمود، ئەمە لە كاتێكدا بوو كە ئینگلیزەكان زۆربەڕوونی بەوەیان دەزانی و ناوبەناو سەرزەنیشتی شێخ مەحمودیان دەكرد لەو بارەیەوە، لە هەمانكاتدا بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدابوون كە چۆن ئەمجارەیان ناوچەكەو سلێمانیان دەسكەوێتەوە، ئەوەبوو دوای ئاگاداركردنەوەی دانیشتوان و شێخ مەحمود لە ڕەشەمێی ساڵی١٩٢٣دا كەوتە هەوڵی داگیركردنەوەی ناوچەكەو، شێخ مەحمودیش ناچاركەوتە خۆی و دووبارە پەنای بردە بەرشاخەكان و لە(جاسنە) ی ناوچەی سورداشدا ماوەیەك مایەوە بە جۆرێك هەر لەوێشدا بلاوكراوەی(بانگی هەق) كە بەسەر یەكەوەتەنها(٣)ژمارەی لێ دەرچووە بلاوكردەوە، سەرەڕای هەوڵی بەردەوامی بۆ دووبارە گرتنەوەی شارودوای ئەوەی ئینگلیزەكان لە ئازاری ١٩٢٣دا كەوتنە بۆردوومانكردنی شارو دوای ئەوەی داگیریان كردەوە، بێ ئەوەی شێخ مەحمود كۆڵ لە حوكمڕانیەتی كوردستانیدا، بۆ جارێكی تر لە مانگی گەلاوێژی هەمان ساڵدا توانی دەسەلاتی بەریتانی لێ وەردەنێ و، توانی بۆ ماوەی یەك ساڵی تەواو تیایدا بمێننەوە، واتە تا ئەوكاتەی پیلانی نێودەوڵەتی لۆزانی ١٩٢٣ مەسەلەی كوردی خستە سەر ڕەفەی لەبیركردن و توركانی كەمالی و بەریتانیای كردە هاوپەیمان بەجۆرێ ولاتانی تری هاوپەیمانیش بە هۆی بەرژەوەندی خۆیانەوە، بوونە پاڵپشتیكەری تەواوی ئەو بارودۆخەو لە لایەكی دیكەشەوە بەریتانیا كەوتە ئەوەی ڕێگا بۆ ئەوە خۆشبكا كە لە ڕێگای(كۆمەڵەی گەلان)ەوە ویلایەتی موسڵ واتە كوردستانی باشور، بلكێنرێ بە عێراقی عەرەبییەوە، ئەمەش ڕێگا خۆشكردنێكی تەواوبوو بۆ كۆتایی هێنانی دەسەلاتی شێخ مەحمود لە كوردستاندا وەك ئەوەی لە

ناوەڕاستی تەموزی(گەلاوێژی ساڵی١٩٢٤)دا عێراق و بەریتانیا بە دووقۆڵی و لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە، توانیان دەستبەسەرشاری سلێمانیدا بگرن و فشارێکی ئەوتۆ بخەنە سەر شێخ مەحمود وهێزەکەی کە بەرەودەورو بەری سورداش و دواتر بۆ ناوچەی(پێنجوین) پاشەکشە بکاو کۆتایی بە دەسەڵات و حوکمداریەتی دووەمی بهێنن، هەر چەندە دواتریش ئینگلیزەکان هەوڵیاندا لە ڕێگای وتوێژەوە وا لە شێخ مەحمود بگەیەنن، کێشەکان چارەسەربکرێ، بۆ ئەوەش ڕێگەدرا نوێنەری شێخ مەحمود کە(صاڵح زەکی بەگ) بوو، سەردانی بەغدای کردو، چاوی بەنوێنەری حکومەتی عێراق و بەریتانیا کەوت، بێ ئەوەی ئەنجامێکی ئەوتۆی لێ بکەوێتەوە، بۆیە بەریتانیا کەوتە ئەوەی، دەبێ ڕاستەوخۆ شێخ مەحمود ببینن و، کێشەکانی لەگەڵدا یەکلایی بکەنەوە، ئەوەبوو بۆ یەکتربینین و وتووێژی نێوانیان شارۆچکەی(خورماڵ= گوڵ عەنبەر) دەستنیشان کراو دوادانیشتنی حکومەتی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی(کەنهان کۆرنوالیس) و (شێخ مەحمود) لە ٤ی ئەیلولی١٩٢٦ بەڕێوەچوو، نزیکەی ٣سێ سەعاتی تەواوی خایاند. بەڵام تەنها لە چەند مەرجێکی سەرپێی نەبێ کە شێخ مەحمودیش پێیان ڕازی نەبوو، شتێکی ئەوتۆی لێ نەکەوتەوە و بۆ جارێکی دی تێکهەڵچوون لە نێوان هێزەکانی شێخ مەحمود و(بەریتانیا-عێراق)دا سەری هەڵدایەوە و، درێژەی کێشا تا ئەوکاتەی جەعفەرعەسکەری(بەنەژاد کورد؟!) کە ئەوکات دوای(عەبدول موحسن ئەلسەعدون) کرایە سەرۆك وەزیرانی عێراق لە ناوچەی(پێنجوێن) سەردانی شێخ مەحمودی کرد و ڕێگای بۆ ئەوە خۆشکرد کە بچێتە بەغداو ڕاستەوخۆ بە خۆی چاوی بە مەندوبی باڵای بەریتانیا لە بەغدا بکەوێ، وەك ئەوەی دوادانیشتن و ڕێکەوتنامەی نێوانیان لە ١٩ای کانوونی دووەمی١٩٢٧دا مۆر(واژۆ) کراو، تا ڕادەیەك

سنووریکیان بۆ کێشەکانی نێوانیان دارێـژرا بـەو مەرجەی شێخ مـەحمود جارێکی تر دەس نەداتە شۆرش کردن و، خاڵێکی تری ئەو ڕێکەوتنامەیـەش ئـەوەبوو کـە شێخ باباعـەلی کوڕی وەك بارمتـە لـە بـەغدا بهێڵێتـەوە و، لـە ژێرچـاودێری دەوڵەتدا درێـژە بـە خوێندنـی خۆی بـدات، سـەرەڕای چـەند مەرج و بنەمایەکی تر کە لە هەمان دانیشتندا خرایە بەرباسکردن.[٤]

[٤] ئـەم بابەتـە لـە ڕۆژنامـەی(کوردسـتانی نـوێ) ژمـارە(١٩٥٣)ی ١٩٩٩/٩/٢٠دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی چوارەم

## نیقیە و نەعنێر و خەباتی ژن
## لە ڕاپەڕینی ئیبراهیم خاندا

هەر كاتێك باس لە شاری دێرینی كفری كرابێ لەگەڵ ئەوەشدا باس لە كۆمەڵێك ناو و قۆناغی مێژوویی گرنگ كراوە كە بەسەر ئەو شارەی كوردستاندا تێپەڕیوە. بە ڕادەیە هیچ كام لەم گۆڕان و ڕووداوە یەك لەدوای یەكانەی مێژوو. بەئاسانی نەیانتوانیوە ڕەسەنایەتی و تایبەت مەندیەكەی بشێوێنن. هەر بۆ ئەوەش بیسەلمێنن كە ئەم شارە تەمەنێكی لە مێژینەی هەبووە و، گەلێ ڕووداوی مێژوویی لە دەوروبەری كفری و ئەم تەوەرەوە سەرچاوەیان گرتبێ، ئەوا هەموو ئەو ناوو دەسنیشان كردنە مێژووییانەی لە هەر سەردەمێكدا بە سەرناوەكەیدا بڕاوە و تائێستاش ماوەتەوە لە گەڵ ئەوەشدا بۆ خۆیان دەلالەت لەو یادەوەریانە دەكەن كە بەسەر شارو ناوچەكەدا هاتوون وەك ناوە دێرینەكانی(كیماش، لاخیرۆ، كیرۆهرجیا) و لە سەردەمی حوكمڕانیەتی عوسمانیەكانیشدا شاری(كفری)بە(صلاحیە) ناوبراوە. كە ناكرێ لە بابەتێكی كورتی وادا هەموو ئەو ناوو ڕووداوانە

شیبکەینەوە و باسیان لێوەبکەین، چونکە لێرەدا باسکردنی سەرەکیمان و مەبەستمان لە یادەوەری ئیبراهیم خانی دەلۆو مێرخاسی و خەباتی ئافرەت وژنە کوردێکە کە بەردەوام لای خەڵکی ئەو شارە و دەوروبەری گەرمیان بۆتە وێردی سەر زمانان و، هەردەم گەواهی مێژوویی بۆ دووپات دەبێتەوە کە ئەمەش بۆخۆی باسکردنە لە کەسایەتییەکی ژنی وەك(نەعیمە مستەفا)ی خەڵکی کفری کە لە ناو دانیشتوان و ئەم تەوەرەی گەرمیاندا بە(نەعەنێر) شۆرەت و ناوبانگی ڕۆیشتوە هەرچەندە لە خوێندنەوە و باسکردنی مێژووی دێرینەی عێراق و شاری کفری دا گەڵێ جار زانایەکی ناسراوی عێراقی وەك(دکتۆر سامی سەعید الأحمدی) کە بۆ خۆی مێژووناس و شارەزایەکی دیاری عێراق بوو لە بواری مێژووی کۆندا. لە سالانی خوێندنم لە(زانکۆی بەغدا و ئادابی مێژوو) دکتۆر کە باسی لە ئیمبراتۆریەتی ئاشوری و(ئاشور پانیپاڵ)ی شای ئاشووری بەناوبانگی بکردایە دەیگوت: یەکێك لە ژنەکانی ئەم شایە خەڵکی شاری(لاخیرۆ) بووە. کە دەکاتە(کیماش) و شاری(کفری) ئەمڕۆ، واشی دەگێڕایەوە ئەوژنەی(ئاشوورپانیپاڵ) ناوی(زەقوتیە نیقیە) و دایکی (سەردناپۆلس) ی کوڕی ئاشووربووە، کە بۆ خۆی ماوەیەك دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری گرتۆتە دەس، بەلام زۆر بەداخەوە دکتۆر سامی هەر کە باسی کوردایەتی ئەو شارە و گەڵێ شاری دێرینی تری کوردستانت دەکرد، پێی قەڵس دەبوو، بەو هەموو(قۆشمەبازی)یەی خۆیەوە کە بەردەوام شۆڤێنیەتی لێ دەباری و بەپێکەنینێکی سەیرەوە، هێرشی دەکردە سەر مێژووناسانی کورد و دەیوت:"مؤرخین الأکراد یکتبون یکتبون بس ماعندهم أدلة؟!" بەهەرحاڵ بۆ چوونێکی مێژوویی ئەو تۆش لە سەرشاژنی پانیپاڵی بە ناوبانگ،

بەتەواوی ئەوەمان بۆ یەکلایی دەکاتەوە، کە ئەم شارە هەر لە دێر زەمانەوە شارێکی تۆکمەو بەردەوام لە ڕووی نیشتەجێ بوونەوە، خەڵکی لێ نەبڕاوە و شارێکی ئاوەدان بووە، لە هەمانکاتدا هەموو ئەمانەش پێویستیان بەلێکدانەوە و، تەتەڵەکردنی مێژوویی و ساغکردنەوەی مێژوویی هەیە، بە جۆرێ دەلالەتی هەموو ئەو ڕوداوانەش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە زۆری لە سیمای شار و بازاڕ و، ئەو شوێنەوارەدێرینانەوە سەرچاوەدەگرن کە ئەوەمان بۆ ئاشکرادەکەن، ئەمانە هەل ومەرج و ڕەوتی بەردەوام قاڵبووی مێژوو دروستی کردبن. بەشێوازێ تاگەیاندونیە ئەو ڕۆژگارەی تێکڕای سەرچاوەکانی مێژوو بە(کۆن و نوێ و هاوچەرخ)ی یەوە باسی لێوە بکەن وەك دەبینی لە٢٢ی ئابی١٩٢٠دا کە ئیبراهیم خانی دەلۆ لەو ڕاپەڕینەی خۆیدا کە شاری کفری لە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان وەرگرتوەو بۆ ماوەیەك ئازادی کرد، کەوتە ئەوەی کۆمیتەیەکی(بەڕێوەبردن) بۆ کاروباری شار دروست بکات، تابتوانێ لە ڕێگایەوە، کاروباری ڕۆژانەی شارو دانیشتوانی ناوچەکە ڕاپەڕێنێ، هاوکات ئافرەتی کوردیش لەو دەمانەدا و لەو شارەدا بەشێوازێکی گشتی لە پاڵپشتی کردن و داکۆکی کردنی ئەو ڕاپەڕینەدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبوەو، بەپێی پێویست ئەرکی ڕۆژانەی سەرشانی خۆیان ڕاپەڕاندووە یەکێ لەو ئافرەتانەش کە شان بەشانی پیاو لە ڕاپەڕینی(ئیبراهیم خان) داو لە مێژووی هاوچەرخی کوردا بووبێتە ناوێکی درەوشاوە و، بەشداری کردبێ(نەعیمە مستەفا)ی کفری بوە، کە لەگەڵ ئەو خەڵکە ڕاپەڕیوەدا بەو ناوو شۆرەت و بەناوبانگی خۆیەوە توانیویەتی جلی پیاوان بپۆشێ و لە یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕیندا، پەلاماری سەرای شاری کفری بدات کە لەوکاتەدا بنکەی سوپای ئینگلیزی لێ بووە، تەنانەت لە زۆر کەسایەتی و پیاوانی بە ساڵاچووی ئەم شارەم بیستوە. لە ساڵی ١٩١٥دا کە

هێشتا عوسمانیەکان دەسەلاتیان بەسەر ناوچەکەو شارەکەوە هەبووە هەر ئەم (نەعیمە مستەفا) یە لەبەر دزێوی و ئاکار و بێ ڕەوشتی ئەفسەرێکی عوسمانی ئەفسەرەکەی داوەتە بەرخەنجەر و، لە شاری کفریدا کوشتویەتی، لەو کاتەشەوە کە ڕاپەڕینی ئیبراهیم خان کۆتایی هات و، دووبارە ئینگلیزەکان کاروباری شارو ناوچەکەیان بەزەبری هێزو چاوساغی چەند کەسێکی ئەلقە لە گوێی خۆیان گرتۆتەوە دەست. بەپێی بۆ چوونی مستەفانەریمان(١٩٢٥-١٩٩٤) (نەعە نێر) واتە نەعیمە مستەفا لە بازاڕی شاری کفریدا، دوکانێکی بازرگانی کردۆتەوە و، بەسیفەتێکی پیاوانە توانیویەتی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی پێ بەرێوەببا، لەبەر ئەوەی لە سالانی جەنگی یەکەمدا مێردەکەی کە بەڕەگەز یەکێك بووە لە تورکمانەکانی کفری، بەرشالاوی(سەفەربەرلەك) واتە(نفیرعام)ی عوسمانیەکان دەکەوێ و لەبەرەکانی شەڕناگەڕێتەوە خۆشی بۆ یەکجارەکی لە سالی١٩٦٣دا کۆچی دوایی دەکاو، بەلام ناوی(نەعەنێر) تا ئێستاش بۆتە وێردی سەرزمانان و لە یادەوەری شاری کفری و ناوچەی گەرمیاندا باسی لێوەدەکرێ.[5]

---

[5] ئەم بابەتە پێشتر لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە ١٩٣٢، سێ شەممە١٩٩٩/٨/٢٤ دا بلاوکراوەتەوە.

# باسی پێنجەم

## کۆنگرەی ئاشتی و مافەکانی کورد
## لە پەیماننامەی سیڤەری نێودەوڵەتیدا

هێشتا جەنگی یەکەم کۆتایی نەهاتبوو، وڵاتانی هاوپەیمان لەبیرکردنەوەی ئەوە دابوون کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بۆ ئاشتی پاش جەنگ ببەسترێ بەڵام تا ئەو کاتەش جێگایەکی دیاری کراویان بۆدەستنیشان نەکردبوو، هەر چەندە هاوپەیمانەکان کۆمەڵێك نەخشەی داگیرکاریان بۆ ئەو ناوچە گرنگانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و جیهان داڕشتبوو کە زۆریان بەلاوە مەبەست بوو بەتایبەتی وڵاتانی بەریتانیا و فەرەنسا وەك ئەوەی لە ١٦ئایاری ساڵی١٩١٦دا ڕێکەوتنامەی سایکس-بیکۆ یان بۆ دابەشکردنی خاکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی(١٢٩٩-١٩٢٢)و بە شێوازێکی نهێنی لە لەندەن داڕشت پاشان هەر یەك لەبەریتانیاو فەرەنسا روسیاشیان لێ ئاگادارکردەوە و، چونێتی ئیمتیازی ئەویشیان لە ناوچەی ناوبراودا دیاری کرد بەڵام هەرکە شۆڕشی گەورەی ئۆکتۆبەری١٩١٧لە ڕوسیا بەرپابوو، بنەماکانی ئەو ڕێکەوتنامەیەی لای وڵاتان ئاشکرا کرد، وەك ئەوەی لەدوای جەنگ زۆر لایەنیان لەوبارەیەوە بۆ هاتەدی کە جەنگیش کۆتایی هات وڵاتی فەرەنسا بۆ شوێنی بەستنی کۆنگرەی ئاشتی دەستنیشاکرا، بەجۆرێ نوێنەری زۆربەی زۆری وڵاتان و گەلان تیایدا

بەشداربوون دیارە دەستنیشانکردنی وڵاتی فەرەنساش بۆ ئەوەبوو، چونکە لە هەموو وڵاتێکی تر زیاتر توشی وێرانی و هەرەسی ئابووری بوەوە هاوکات بۆ ئەوەی دڵی فەرەنساش لەو بارەیەوە بێتەجێ و ڕەوایەتی ئەوەی پێ بەخشراوە کە کۆنگرەیەکی لەو بابەتەی تیابەستری، بۆ ئەو مەبەستە نوێنەری هەریەك لەگەڵی کورد و ئەرمەن کەدوو نەتەوەی زۆرلێکراوو ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی و زەرەرمەندی ئەو دەمەبوون، ڕێگەی ئەومیان درا کە نوێنەری خۆیان لەو کۆنگرە نێودەوڵەتییەدا هەبێ، هەریەکەو بەناوی گەل و وڵاتیانەوە داکۆکی لە مافەکانی خۆیان بکەن، سەبارەت بە کورد، دەتوانین وای باس لێوە بکەین کە لە دووتەوەری سەرەکی کوردستانەوە، ئەو ڕەوایەتیە بەخشرا بە(ژنەراڵ شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشای خەندان) کە ئەوکات دانیشتووی پاریسی پایتەختی فەرەنسابوو، تا وەك نوێنەری کورد لەو کۆنگرەیەدا و لە ساڵی١٩١٩دا بەشداربێ و، پرۆژەیەك لەبارەی مافەکانی کوردەوە بخاتە بەردەم ئەندامانی کۆنگرە. یەکێکیان لە لایەن ئەو ڕێکخراوەو کوردیانەوە بوو کە لە ئەستەمبوڵی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و پاش هەڵگەڕانەوەی عوسمانی ساڵی١٩٠٨دامەزرابوون، بەتایبەتی(کۆمەڵەی تەعالی کوردستان) و کەسانی سەر بەبنەماڵەی بەدرخانی بەناوبانگ لەلایەکی کەشەوە لە شاری سلێمانییەوە، پێش لە ناوچوونی یەکەم حکومەتی شێخ مەحمود و دوورخستنەوەی گەلاڵەنامەیەکی بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرد و بەهەردوو کەسایەتی کوردی ئەودەمەدا کە هەریەك لە ڕەشید زەکی کابان و سەید ئەحمەدی بەرزنجی بوون بە ڕێگای شامدا ناردە پاریس کەچی لە شام و شاری حەلەب ڕێگای چوونە پاریسیان نەدراو ئەم گەلاڵەنامەیەی دوایی و کوردانی باشوور نەگەیشتە شوێنی مەبەست.

پێش ئەوەی کارەکانی کۆنگرە دەس پێبکا. کۆبوونەوەیەکی دووقۆڵی بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانی یەکتر لە نێوان(بۆغۆس نۆبار پاشا)ی سەرۆکی وەفدی ئەرمەنی و(شەریف پاشای خەندان)ی نوێنەری کورداندا بەسترا، تیایدا باس لەوە کرابوو کوردەکان پشتگیری لە سەربەخۆیی ئەرمەنەکان دەکەن و، ئەوانیش پشتگیریکەری سەربەخۆیی وڵاتی کوردانن. بەپێی ئەو گەڵاڵە نامەیەی کە شەریف پاشا پێشکەش بەکۆنگرەی ئاشتی کرد دواتر وای لە وڵاتانی هاوپەیمان کرد کە ناوی کورد و، مافەکانی کورد بخرێتە چوارچێوەی بنەما سەرەکییەکانی پەیماننامەی نێودەوڵەتی سیڤەری١٠ی ئابی١٩٢٠ەوە، هەر چەندە دوو وڵاتی گەورەو هاوپەیمانی وەك بەریتانیا و فەرەنسا لەو ڕێکەوتنامەیاندا کە لە(سان ریمۆ) ولە٢٤ی نیسانی ١٩٢٠دا واژۆیان کرد، فەرەنسا دەستی لە زۆر ئیمتیازی خۆی هەڵگرت لەو ناوچانەدا کە لە چوارچێوەی(ویلایەتی موسڵ)دا دەستی دەکەوت بۆ بەریتانیا، بەتایبەتی ئینتدابی ویلایەتی موسڵ یاوەکتر کوردستانی باشوور، بەڵام لە پەیماننامەی سیڤەری ١٩٢٠دا کە لە شوێنی کارگەیەکی کاشی دروست کردنی نزیك بە شاری پاریس بەسترا لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمان و نوێنەرانی زۆربەی گەلان و تورکدا.

ئەم پەیماننامەیەش بۆ خۆی لە(١٣)بەش و(٤٣٣)برگە پێکهاتبوو گرنگترین بەشەکانی بەشی دووەم وسێیەمیەتی کە بەتەواوی بنەماکانیان سنووری وڵاتی تورکیاو ڕەوشی سیاسی یەکلایی دەکردەوە و، بەپێی برگەکانی(٦٢،٦٣،٦٤)ی کە دەکەونە بەشی سێیەمیەوە.

بەتەواوی دان بە پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ دادەنێ. بەشێوەیەکی ئەوتۆ برگەی(٦٤)ی ئەم پەیماننامەیە، ئەم لایەنەی ڕوونکردۆتەوە کە تیایدا هاتوە:(ئەگەر کوردانی، دانیشتوانی ئەوناوچانەی

بڕگەی(٦٢)دەسنیشانیان دەکا، کۆمەڵەی گەلانیان لە ماوەی ساڵێکدا پاش جێبەجێ کردنی ڕێکەوتنامەکە ئاگادارکردەوە، کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە ئارەزوومەندن بۆ جیابوونەوە لە تورکیاو ئەگەر کۆمەڵەی گەلانیش بڕیاریدا کە ئەوانە شایستەی ئەو سەربەخۆیییەن ئەوا داوا لە تورکیادەکا ئەوداوا کاریە جێبەجێ بکا و دەس لە هەموو مافێکی خۆی لەو ناوچانەدا هەڵگرێ. تورکیاش ئەوەی جێبەجێ کرد، ئەوکاتە وڵاتانی هاوپەیمان هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك ناخەنە ڕێگای ئەو کوردانەشەوە کە لە ویلایەتی موسڵدان و بەپێی ویستی خۆیان دەیانەوێ پەیوەندی بەو دەوڵەتە کوردییەوە بکەن(د.خلیل علی مراد،... ئێران وترکیاص٢٣٤) کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتانی هاوپەیمان زۆر بەڕاستی جەختیان لە سەرجێبەجێ ئەم پەیماننامەیە نەکردۆتەوە، بۆ یە هەر لەو ساڵەداو بەپێی ساغکردنەوەیەکی دکتۆر کەمال مەزهەر:(هەر یەك لە بەریتانیا، فەرەنساو ئیتالیا ڕێکەوتنامەیەکی سێ قۆڵیان بەست لە نێوانیاندا بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتیان لە کوردستانی باکور) لەلایەکی دیکەشەوە ڕووسەکان بۆ پاڵپشتی تورکەکان لەوە دەبوون کە چۆن پیلانێك بۆ تێکدانی بنەماکانی پەیماننامەی سیڤەر دارێژن وەك ئەوەی لە کاتێکەوە بزوتنەوەی کەمالی بە ڕێبەرایەتی مستەفا کەمال(١٨٨٣-١٩٣٨) دەستی پێکرد، ڕووسیای سۆڤیەتی داکۆکیکەرێکی گەورەی کەمالیەکان بوو، چ لەڕوخان و لە ناوبردنی دەوڵەتی ئەرمەنەکاندا ساڵی١٩٢٠، چ بۆ وەدەرنان و پاککردنەوەی شاری(سمیرنا)ی تورکیا لە یونانیەکان پاش ئەوەی سەدان هەزاری لێ کوشتن، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمەریکا، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەلایەکەوە، کەوتنە پاڵپشتی دەوڵەتی تورك و لەلایەکی دیکەشەوە نەیانەویست ئیمپراتۆرێتێکی تری وەك عوسمانیەکان دروست بێتەوە، کە مەترسی هەبێ بۆ سەر بەرژەوەندی و، سیاسەتیان لە

ناوچەکەدا، وێرای ئەوەش هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ لەبەریەك هەڵوەشانەوەی پەیماننامەی سیڤەر کە بنەماکانی، چارەنووسی گەلی کوردیان پێوەگرێ درابوو. جگە لەم ڕێکەوتنامەیەش لە۱۲-۱۸ی ئازاری ۱۹۲۱کۆنگرەیەکی تر، لە ژێرچاودێری بەریتانیاو بەسەرۆکایەتی (ونستۆن چەرچل)ی سەرۆکی وڵاتانی داگیرکراو(مستعمرات) لەقاهیرە بەسترا، لێرەدا سەرەڕای دەسنیشان کردنی شایەکی گونجاو بۆ عێراق یەکێك لە خاڵە سەرەکیەکانی ئەو دانیشتنە سەبارەت بەبەڕێوەبردنی ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی باشوور(عێراق)بوو، لەلایەن کورد خۆیەوە، بەڵام تورکان بە تایبەتی کەمال ئەتاتۆرك دوای ئەوەی ڕای زۆر لە وڵاتانیان بۆلای خۆیان ڕاکێش کردو، هاوپەیمانانیش، بەتەواوی ئەومیان بۆ ڕوون بوەوە. کەسامانێکی نەوتی زۆر دەکەوێتە ئەو هەرێم و ناوچانەوە کە پەیماننانەی(سیڤەر) دەیانگرێتەوە بۆیە کەوتنە ئەوەی لە بەڵێنەکانی خۆیان پاشگەز ببنەوە و، تەنانەت لەودانیشتنەی (کۆنگرەی لۆزان)ی یەکەمیشدا کە ئەتاتۆرك خۆی ئامادەی بوو لە ۲٥ی نیسانی۱۹۲۲دا. ڕووسیای سۆڤێتی و وڵاتەیەکگرتوەکان لەوانە بوون کەداکۆکییان لە تورکیادەکرد و، دوابەدوای ئەوان وڵاتانی تری هاوپەیمانیش لەوە بەدواوە تەنها ئیمتیازی نەوتیان مەبەست بوو. نەك جێبەجێ کردنی ئەو بەڵێنەی لە سیڤەردا بۆ کوردان ئیمزایان لەسەر کردبوو. سەرەڕای ئەوەش وڵاتێکی وەك بەریتانیا ڕێگای بۆ ئەوە خۆشکرد، عێراق نوێنەرێکی خۆی بە سەرۆکایەتی جەعفەر عەسکەری لەگەڵ تۆفیق سویدی داو، وەك چاودێر لەو کۆنگرەیەدا بەشداربن، بۆ ئەوەی لەوە ئاگاداربن کەچی ڕوودەدا، هەر چەندە بۆ ئەو مەبەستەش داوەتنەکرابوو. هەموو ئەم سیاسەتانەی وڵاتانی هاوپەیمان، ڕێگا خۆشکەرێکی سەرەکی بوون، بۆ ئەوەی وڵاتێکی وەك تورکیا لە کۆنگرەی لۆزانی دووەمدا کە لە۲٤ی تەموزی ۱۹۲۳دا بەسترا، بە تەواوی دان بە سەربەخۆییدا بنرێ لە لایەن هاو پەیمانانەوە

و گەورەترین سەرکەوتنی سیاسی لەم کۆنگرەیەدا وەرگری، وەك ئەوەی بە ڕادەیەکی باش ئەوەی بۆ فەراهەم بکەن کە سەروەری (سیادە)ی بەسەر تراقیای ڕۆژهەلات، نۆ گەندەکان، ئەستەمبوڵ و نیمچە دورگەی گالیبولی، ئەزمیر، کیلیکیا، ویلایەتەکانی باشوری ڕۆژهەلات لە ئەنادۆڵ واتە کوردستانی باکور(ا.ب نووسەر)، ئەدرنە و هەندێ لەو دورگە بچوکانەی کەدەکەونە دوری(٣)سێ میل لەکەنارەکانی ئاسیا بۆ تورکیا و دەستهەلگرتنی هێزی هاوپەیمانان لە ناوچەی نۆگەندەکان و ئەستەمبوڵ، سەرەڕای ئەو زەوی و زارانەی کەلەلایەن هێزەکانی بیانییەوە داگیرنەکرابوون بخرێتە ژێر دەسەلات و فەرمانڕەوایەتی تورکەوە لەگەڵ ئەوەشدا هاوپەیمانەکان ئەم شوێن و ناوچەو ئیمتیازانەیان بەشێوازێکی فراوان بەرگەوت:-

١-وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا چواریەکی لە نەوتی ویلایەتی موسڵ بەرکەوت، بەو بیانوەی یەکێك بووە لەوڵاتانی هاو پەیمان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا.

٢-وڵاتی عێراق بکەوێتە ژێر ئینتدابی بەریتانیاوە، پاش ئەوە لەلایەن(کۆمەڵەی گەلان) یشەوە بڕیاری لە سەردەدری، هاوکات ناوچەی ستراتیجی کەنداوی سوێس و سودانیشی خرایە ژێردەسەلاتەوە، سەرەڕای دەسکەوتێکی گەورە لە نەوتی ویلایەتی موسڵ.

٣-وڵاتی فەرەنسا مافی ئینتدابی سوریا و لوبنانی بدرێتێ، جگەلەو دەسکەوتەی کە لەنەوتی ویلایەتی موسڵدا بەرێکەوت، چونکە بەپێی ڕێکەوتنامەی(سانریمۆ)ی ساڵی١٩٢٠دەستی لە مافی ئەوئینتدابەی ویلایەتی موسڵ هەلگرت بۆ بەریتانیا.

٤-هەموو دورگەکانی دودیکانیز کەدەکەونە ناو دەریای ئیجەوە و سەر بەوڵاتی یونانن بەر وڵاتی ئیتالیا بکەوێ، وەك دەبینین بەو شێوەیە

كۆنگرەی دووەمی لوزانی ١٩٢٣هەموو مافێكی كورد، ئەرمەن و یونانی بەپێی پەیماننامەی سیڤەری نێودەوڵەتی پووچەڵ كردەوە و، لێرە بەدواوە ڕێگا بۆ ئەوە فەراهەم كرا، كە توركیای كەمالی:(بەتەواوی سیاسەتی بەتورك كردن دژ بەهەموو ئەو نەتەوانە دەست پێبكا كە خرانە بۆتەی دەوڵەتی كەمالی توركیەوە). سەرەڕای دوورخستنەوە و ڕاوەدوونانی هەموو ئەو كەسایەتیە نیشتمانپەروەرانەی لە هەوڵ و خەبات دابوون بۆ داكۆكیكردن لە مافی وڵات و گەلەكانیان پاش وەستانی جەنگی یەكەمی جیهانی.*

---

*ئەم بابەتە پێشتر لە ڕۆژنامەی (كوردستانی نوێ)، ژمارە (١٩٢٣)ی ١٩٩٩/٨/١١ بڵاوكراوەتەوە.

# باسی شەشەم

## بابەتی مێژووی قوتابخانە سەرەتاییەکان بەزمانی کوردی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

بەگوێرەی ئەم بابەتە مێژوویانە و، لە قۆناغی سەرەتایی خوێندندا بەتایبەتی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا. ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەر لەکاتی دامەزرانی یەکەم حکومەتی عێراقییەوە و دانانی شافەیسەڵی یەکەم(١٨٨٥-١٩٣٣) بە فەرمانڕەوای عێراق لە١٩٢١/٨/٢٣دا و لەلایەن حکومەتی بەریتانییەوە. هەندێ گۆڕانکاری هاتۆتەکایەوە بەجۆرێ زۆر لە دانیشتوانی عێراق بەکورد و عەرەبی یەوە بەر شەپۆلی ئەم گۆڕانکاریە کەوتوون و لەگەڵ ڕەوت و تایبەتمەندیەکانیدا ڕۆیشتوون هەر چەندە دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە عیراقدا و لە سەردەمی پاشایەتی و بەتایبەتی لەکاتی دەسەڵاتی فەیسەڵی یەکەم بەدواوە، زیاتر بایەخ و ئامانجیان ئەوەبووە کە درێژە بە سیاسەت و مانەوەی خۆیان بدەن لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا بەگشتی وولاتی عێراق و کوردستان بە تایبەتی، هەر بۆیەش لە بواری ڕووناکبیری داو بەپلەی یەکەم بۆ بەرژەوەندی خۆیان بایەخیان پێداوەو لایەنە جۆربەجۆرەکانیان تاوتوێ کردوە. واتە هەر لەکاری ڕۆژنامەنووسیو بڵاوکردنەوەی چەندین

گۆڤارو ڕۆژنامــە بــە زمـانی عـەرەبی و كوردی و هـەر لەلایـەن خۆشیانەوە تـا ڕادەیەك یارمەتی بڵاوكردنەوەیان داوە تەنانەت هەندێكیان هەر بە خۆشیان كاروباری بەڕێوەبردنیان بەدەستەوە بوە و، زیاتر بۆ پیادەكردن و بەدیهێنانی مەرامی خۆیان بەكاریان هێنـاوە. هـەر چـەنـدە ئـەم گۆڤـار و ڕۆژنامانـە خـاڵی نەبوون لە بڵاوكردنەوەی بارودۆخی ڕووناكبیری و بڵاوكردنەوەی بابـەتی زۆر لە ڕووناكبیرانی عێراقی ئەوكاتە بە كورد و عەرەبیـیـەوە هـەر لـەدەرچوونی یەكـەم ڕۆژنامـەی عـێراقی كـە(الـزوراء)ی سـاڵی ١٨٦٩ی سـەردەمی مەدحـەت پاشـابووە، تادەگاتـە(پێشكەوتن)،(تێگەیشتنی ڕاستی) ودواتـر (دەنگـی گێتـی تـازە)ی كـاتی فەرمانڕەوایـەتی ئینگلیـز، جا ئەمانـە وەكو وتم وەك نـــاوەڕۆك هەرچەندە زۆر بابەتی دەوڵەمەند و بەكەڵكیان لە خۆیان گرتـووە، لـە هـەمان كاتیشـا زۆر لەمــەرام و ئامـانجی دەســەڵاتدارانی ئینگلیزیـان لــە عـێراق و كوردستـاندا هێناوەتـەدی و، بـۆ ئـەو سـەرو بـەندو ڕۆژگـارەش سوود و بـەهای تایبـەت بـە خۆیـان هـەبووە بـۆ پیـادەكردنی سیاسـەتی دەســەڵاتداران و زۆر كاروباری لاسەنگی بـۆ سـەنگ كردونەتـەوە. پێشم وابێ لێرەدا پێویست ناكـا زۆر بەتان و پۆی بابەتێكی وادا بچم چونكـە ئـەو لایـەن و بابەتانـەی كـە نـاوم بـردن هەریەكەو پێویستیان بەلێكۆڵینـەوەی سـەربەخۆ هەیـە. بـەڵام لـێرەدا دەمەوێ لەو بابەتە مێژووییانە بدوێم كە لە سەرەتاكانی سـەدەی بیستەمەوە لە قوتابخانەكان و قۆناغی سەرەتایی خوێنـدنـدا خوێندكـاران بـەزمانی كوردی بڵاوكراونەتەوە، جا ڕەنگە هـەر هەمووشـیان نەگرێتـەوە[٦] بـەڵام ئـەم بابەتانـە،

---

[٦] دروس التاريخ

مترجم و مؤلف

مديری مكتبی اول سليماني قفطانجي زادة صالح صدقی

لەبەر ئەوەی سودی تایبەتیان هەیە بۆ سەر ڕەوت و باری ڕووناکبیری کوردی و دەبنە بنەمایەکی سەرەکی بۆ خوێندنی بابەتی مێژوو لە قوتابخانەو خوێندگاکانی کوردستاندا. لە هەمان کاتیشدا جۆرێکە لە سیاسەتی دەسەڵاتدارانی عێراقی و ئینگلیز لە کوردستاندا بۆ هێور کردنەوەیان و پاڵپشتی کردنی حوکمی پاشایەتی کە هەر لە سەرەتای دەسەڵاتیانەوە بە پلەی یەکەم ئامانجی داگیرکەرانیان هێناوەتەدی و بەتەنگیەوەچوون هەر چەندە بۆ کارێکی وا، دەسەڵاتدارانی دوای ئەوان، لەوان کەمتریان نەکرد. تەنانەت لە سەردەمی حوکمڕانیەتی کۆماریشدا کە پێویست بە سەلماندن و هیچ بەڵگەیەك ناکا. بەهەرحاڵ وانەی(مێژوو) یاخود بڵێین بابەتی مێژوو لە قوتابخانەکانی کوردستاندا هەر هەمان ئەو بابەتانە بووە کە لە قوتابخانە عەرەبییەکاندا خوێندراوە. تەنها ئەوە نەبێ کە لەلایەن چەند ڕووناکبیرێکی ئەو کاتەی کوردەوە کراون بە کوردی کەچی بە ناوەڕۆك بە هیچ جۆرێك باس لە نەتەوەی کورد و داب و نەریتو ڕەگەزو و مێژووی کورد ناکات. تەنها لەیەك دوو شوێندا نەبێ کە ئەمانەش زیاتر پابەندن بە باس کردنی(صلاح الدین)ی ئەیوبی یەوە لەم بارەیەشەوە لە مێژووی پۆلی دووەمدا و لە لاپەڕە(٥٠)یدا نووسراوە:(صلاح الدین کوردە اخری بوە بە قوماندانی لە شکری پادشای(موصلی) بۆ یاریدەی ئیسلام[٧] چوە شام و مصر)ەوە. هاوکات

---

مطبعة الفرات:بغداد سنة١٣٤٥هیجریة ، سنة١٩٢٦میلادیة-

[٧] دروس التایخ

ترجمە

سیدنوری بەرزنجەی مدیری

سید فتاحی بەرزنجەی رئیسی اول لة جیشی عراقیدا

لەلاپەڕە(٨٧)ی بابەتی مێژووی پۆلی چوارەمی سەرەتاییشدا وێنەیەکی(صلاح الدین) دانراوە و لە خواری وێنەکەشەوە نووسراوە:"فخری ئیسلام و کورد صلاح الدین ایوبی) ئیتر ناو بێنەو دەس بشۆ. بەڵام دڵخۆشکەری ئەم بابەتانە لەوەیاندا دەردەکەوێ کە زمانی کوردیش لە عێراقدا و، لەو دەمانەوە نەیانتوانیوە حەق و حیسابی بۆ نەکەن. دیارە ئەوەشیان زیاتر لە دوو تەوەری گرنگ یان سەرچاوەی گرنگەوە سەری هەڵداوە یەکەمیان: سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لەبەشی کوردستانی باشووردا و دووەمیان: گەشەکردنی بەرچاوی ڕووناکبیریی کوردی کە لە هەنگاونان و گەشەکردنی بەردەوامدا بووە. وەکو وتم بەتایبەتی لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم و پاش جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨)وە. کوردیش کەوتۆتە خەبات و سەرەڕای ئەو هەوڵ و کۆششەی کە ڕووناکبیرانی کوردی وەك: صالح سدقی زادە، سەید نوری بەرزنجەیی، ئەمین زەکی بەگ و مامۆستا تۆفیق وەهبی کردوویانە، ئەمەش بۆ خۆی وای کردوە کە زمانی کوردی شان بەشانی

---

مدرسە ی فضل وەخطیبی مزکەوتی احمدیة لە بغداد

لەسەر فەرمایشی وزارتی جلیلەی معارفی حکومتی عراقی بەموجبی پیش رەوی صنفی چوارەمین ریك خرا

چاپی یەکەمین

حقوقی اعادەی طبع محفوظە بو مؤلفە کان

هەر نسخە یك کە مور و یامضای یکی مؤلفە کانی پی‌وە نەبێ بەساختە ازمیرری

محمود حلمی

صاحبی کتیبخانەی عصریە لە بغداد داطلب اکری

چاپخانەی(فرات) لە چاپ درا

بغداد:١٣٤٧ھ ١٩٢٨م

زمانی عەرەبی لە عێراق و کوردستانی باشووردا گەشەبکاو فۆناغ و ڕەوتی خۆی ببڕێ هەرچەندە لەلایەن دەسەڵاتداران و ئەوانەی کوردیان بەباوەکوشتەی خۆیان زانیبێ چەندین قۆرت و تەگەرەی هاتۆتە ڕێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەیان ئەوە ناگەیەنێ کە بڵێین ڕەوتی ڕووناکبیریی کوردی وەستاوە و کۆششی بۆ نەکراوە. ئەوەتا هەر لە سەرەتای بابەتی مێژووی پۆلی دووەمی سەرەتایی داو مامۆستا ساڵح سدقی زادە دەنووسێ:"ام کتیب تاریخە بو صنف دوم أولی ترتیب کراوە. موافق بە پروغرامیکە کە نظارت جلیل معارف داینــاوە . لەسەر روشتی تازە بە أرەزوی خدمت بو مندل ملت امید أوە دەکەم کە ام چند پەرەیە لە ریز کتیبانیکا کە فائیدەیان هەیە بو خویندنەوەی شوینیکی ببن و بەخدمتی قبول بکری". هەر دوا بەدوای بابەتی مێژووی پۆلی دووەمی سەرەتایی و لە کتێبی پۆلی سێیەمدا کە هەرسێ ڕێکخەر و وەرگێڕی ڕووناکبیری ئەوکاتەی کورد. مامۆستایان سەعید سدقی کە لەوکاتەدا مامۆستا بوە لە سلێمانی و سەید نوری بەرزنجەیی کە ئەویشیان بەڕێوەبەری قوتابخانە(فضل) وئیمام و خەتیبی مزگەوتی ئەحمەدی بوە لە بەغدا و، سەید فەتاحی بەرزنجەیی ئەمیش(رئیس أول) واتەپلەی (ڕاند)ی هەبووە لە ڕیزەکانی سوپای عێراقدا لە سەر بەرگی[٨]

---

[٨] درس تأریخ

ریك خەر ومترجم

سعید صدقی، سید نوری بەرزنجی، سید فتاح برزنجی

معلمی مکتبی اول مدیری مدرسەی فضل وخطیبی رئیس اول لە جیش عراقیدا

لەسلیمانی مزگەوتی احمدی

چاپی یەکەمین

حق ▪ چاپ دانەوەی عائدەبەریك خەرەکان

كتێبی(دروس التأریخ بە لغتی كوردی) نووسیویانە:"حق لـە چاپدانـەوەی عائدە بەریك خەرەكان. هەر نسخەیەكی مۆری وزارەتی معارفی پێوەنەبی ساختەیە" نرخەكەشی وەكو لە سەری نووسراوە لەو كاتەدا بە(٦)شەش عانە بوەو لە سالی١٣٤٨ی كۆچی لە چاپخانەی(نـەجاح) چـاپكراوە. كـە هاوكاتـە لەگەڵ ساڵی(١٩٣٠)ی زایینیدا.

جگە لەوانـە لـە كاری بلاوكردنـەوە و لـەچاپدانی كتێبـی مێـژووی پۆلی چوارەمدا بە تەواوی جێ دەستی مێژوونووسی گەورەی كورد ئـەمین زەكی دیارە كە لـەو كاتـەدا وەزیـری(اشغال)بـووە. هـەر وەك وەرگێڕەرانی كتێبەكـە خۆیـان سوپاسـنامەیەكیان بـۆ جـەنابی ئـەمین زەكـی نووسـیوەو تیـایدا وتویانە:"جنابی سەروەری ملتی كوردان وزیری اشغال و معارفی پیشو حزرتی مجمد أمین زكی بەگ. أم كتیبی تاریخی اسلامە بەقلم رادانی معالیتەوە شەوق درابو. خودای عزوجل لە هەموایش و كاریكی خیردا موفق تان بكا. دائما پایـە بەرزبی بو ترقی علم و معارف سعی وتی كوشینتان موجبـی افتخاری گـەورە و بچوك مانە".

لەخواریشەوە هەردوو ڕوناكبیر سەیدنوری بەرزنجەیی و سـەید فـەتاحی بەرزنجەیی ئیمزایان كردووە. ئەم كتێبـەش لـە ساڵی ١٣٤٧ی كۆچی بەرامبـەر بە ساڵی١٩٢٨ی زایینی لـە چاپخانـەی(الفرات)ی بـەغدا لـە چاپدراوە. بـەزۆری ناوەرۆكی ئەم كتێبە مێژووییانە كـە نـاوم بـردن بـاس لـە دەوڵەتی ئیسلامی و

---

هەر نسخەیی‌كی مور وزارتی معارف پیوەنەبی ساختەیە

(بغداد)

لە چاپ خانەی نجاح لە چاپ دراوە

١٣٤٨هـ-١٩٣٠م

ئەو ناوچانە دەکەن لە کاتی فەرمانڕەوایەتی دەوڵـەتی ئیسلامیدا بـرەوی تایبەت بە خۆیان هەبوە دوایی باس لە ڕۆڵی بەشێکی زۆر لە پێشەوایانی ئیسلام دەکا لە ڕێگای ئەو برەوپێدان و گەشە کردنەدا و هەروەها گەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ناوچە جۆربەجۆرەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و هاتنی زۆر لەوانەی کە بەربەرەکانی حوکمی ئیسلامیان کردوە. وەك هێزی مەغۆل، بویهیەکان و سەلجوقیەکان و بەربەرەکانی کردنیان بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عەباسی لە ساڵی ٦٥٦ی کۆچی بەرامبەر١٢٥٨ی زایینی. پاشان هەردوو ڕێکخەر و وەرگێڕ ئەم چەند دێڕەیان بۆ خوێنەران و خوێندکاران ڕوون کردۆتەوە کە لە بەشێکیدا نووسیویانە:(بەعنایەتی خوداوەندی هەمو کون و کائنات و بە امدادی روحانیەتی حضرتی پی غەمبەری آخر زەمان محمد المصطفی(صلی اللة علیە وسلم) کتابی تاریخی اسلام بەزمانی کوردی ڕێکخرا بە موجبی پیش رەوی وەزارەتی جلیلەی معارف بو قوتابی صنفی چوارەمینی مدرسەی ابتدائی تخصیص کرا گەلی مباحثی بەکەلکی تیا هەیە کردەوەی خلفا و پادشاهان و پیاوماقولی بدایتی اسلامان پیشان دا. بو هەموو موسلمانیکی کورد لە فائدە خالی نیە. لەگەڵ ئەمەشدا أم کردەوەیەمان بی قصورنیە. انشا عاللە لە استقبالدا لە طرف کورانی سنوری وطنمان گەلی کردەوە و کتیبی نایاب و لەمەچاك و باش دەبی موجبی استفادەی گەورە و بچوك وە أم دو عبدی عاجزە مسرور و خوش حال دەبن. جنابی حق همو وقتی علم و معارف پەروەران موفق وە پایە داربکا.

*ئەم نووسینە پێشتر لە گۆڤاری (کازیوە) ژمارە (٦) ساڵی ١٩٩٤دا بلاوکراوەتەوە.

# باسی حەوتەم

## هەمزە عەبدوڵڵا
## لەنێوان ژیانی پەناهەندەیی و هەڵوێستی سەید ئەحمەدی خانەقادا

دیاری كوردستان وەك گۆڤارێ یـا هەفتەنامەیـەكی بڵاوكـراوە یەكـەم ژمـارەی ڕۆژی چوارشـەممە ١١ی مـارتی سـاڵی١٩٢٥و دوا ژمـارەی كــە ژمارە(١٦)شازدەیەتی لە ١١ی مایسی١٩٢٦و ڕۆژی سێ شەممە لـە شاری بـەغدا بەهـەر سێ زمـانی(كـوردی، عـەرەبی و توركـی) بڵاوكراوەتـەوە. خـاوەنی ئیمتیازی ساڵح زەكی ساحێبقڕان (١٨٨٦-١٩٤٤) زادە و بەڕێوەبـەری ئیدارەشی ڕەشید شەوقی بووە. بەڵام پێ دەچێ تا ڕۆژی داخستن و وەستانی گۆڤارەكە نەیانتوانیوە لەكاتی خۆیدا و هەفتانە بڵاوبكرێتەوە(بڕوانە، كاروان، ژمـارە، ١١٠ اب نووسـەر). وەك دەبینـی لـە ژمـارە (٥)یـدا كـە ڕۆژی سێ شـەممە١٢ی مایسـی١٩٢٥ بڵاوكراوەتـەوە. لـە هەردووبەشی(عـەرەبی و توركـی)یەكـەیدا. هەواڵێك سەبارەت بە كە سایەتی و پیـاوی ناسـراوی شـاری كـەركوك سـەید ئەحمـەدی خانـەقا(١٨٦٨-١٩٥٢)بڵاوكراوەتـەوە. بەوەشـدا وادەردەكـەوێت لـە لایەن حكومەتی پاشایەتی عێراقەوە و لەسەر هەڵوێستی سیاسی و داكۆكـی كردن لە مافی گەلەكەی لە شاری كەركوك، لـە مـانگی مـارتی سـاڵی ١٩٢٣ەوە،

دورخراوەتــەوە بــۆ شــاری بەســرەی باشــووری عــێراق، وەك لەبەشــی تورکی(تورکجە قسمی) وتەنانـەت بەشە عەرەبیـیەکـەی گۆڤارەکـەو هـەمان ژمـارە(٥)یـدا وای نووسـیوە:(سـەید ئەحمـەدی خانـەقا سـەرکردەیەکی بەناوبانگی کوردە، لەلایەن حکومەتەوە فەرمانی ئەوەی بە سەرادراوە، کە بۆ مـاوەی دووسـاڵ و نیـو لـە شـاری بـەغدا و بەسـرە بمێنێتـەوە و لـەم دواییەشدا و پـاش ئـەوەی حکومـەتی خـاوەن شـکۆ ڕێگـەی پێـدا لـە ٦ی مایسی١٩٢٥ دا گەڕایەوە بۆ شـاری کەرکوك) هەواڵی دورخستنەوەیەکی لـەم بابەتەش هەر چەندە فەرمانڕەوایانی عێراق مەسەلەی تورك خوایان دابوە پاڵی بەڵام زیاتر لەسەر ئەو هەڵوێستەی بوو کە پاڵپشتـیەکی گـەورەی لـە کورد و خەباتی کوردایەتی دەکرد کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە تـا ڕۆژی کۆچکردنی لە٣٠ی ئابی ١٩٥٢دا ئەوەش بۆ خۆی لە کوردستانی باشوور لـە شۆڕشـەکانی مـەحمودەوە سـەرچاوەیان دەگـرت. بـەجۆرێ هەڵوێسـتێکی لەموای لە حکومەتی شافەیسەڵ(١٨٨٥-١٩٣٣)و بەریتانیا کرد کە لە ١ی مـارتی سـاڵی١٩٢٣ەوە ئـەو کـە سایەتیە ناسراوەی کورد بەفرۆکەیەکی تایبـەت لـە شاری بەسرە. دوابەدوای ساڵ ونیوێك دەستبەسەری دوای گەڕانـەوەی شێخ مەحمودی نەمر لە(دورگەی ئەندامان)ەوە بۆ بـەغدا وپاشان بۆ کوردستان ئەمیشیان هێناوە تەوە بەغدا و لێرەش بۆ ماوەی ساڵێك خستوویانەتە ژێـر چاودێرییەوە و ئەو جا ڕێگەیان داوە بگەڕێتەوە شاری کەرکوك بەڵام لێرەدا ناکرێ ئێمە تەنها وەك کـە سایەتیەکی سیاسی باس لـە سـەید ئەحمـەدی خانەقا بکەین، بەڵکو وەك ئەوەی لە بنەماڵەیەکی ئایینی و لەساڵی(١٢٩٠)ی کۆچی بەرامبەر بە ١٨٦٨ی زایینی هاتۆتە دنیـاوە بەرەسـەن دەگەڕێتـەوە بـۆ شـێخ سـەمەدی باپـیرەی سـاداتی بەرزنجـەو، سـەید حوسـەین ئەفـەندی خانـەقای باوکیشی کـەلای هـەموان بـە زانـا وشـارەزایەکی ناسـراوی بـواری

زانست و ئەدەب شۆرەت وناوبانگی ڕۆیشتوە، کوڕی شێخ ئەحمەدی سەرگەڵوی بە ناوبانگەو، خاوەنی شۆرەت و مەقامێکی تایبەت بەخۆی بووە. بۆخزمەت کردنی زانست و کردنەوەی ناوەندی زانستی و ئاینی لە وڵاتی کوردستاندا بەڕادەیە خانەقاکەیان بووە بە ناوەندێك کەلەهەموو سەردەمێکدا دەیان پیاوی ئایینی و سیاسی و خاوەن قەڵەمی بە برشتی لەدەوری خۆی کۆکردۆتەوە و جگەلەوەش شوێنێکی گرنگ بووە، بۆ حەوانەوە و پاراستنیان لە هەر مەترسی و فشارێك کە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە کرابێتە سەریان بەهۆی جیاوازی بۆ چوون و داکۆکی کردنیان لەهەر بوارێك کە بە حەق و شایستەیان زانیبێ وەك مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا (١٩١٥-١٩٩٨) کە لەودەمانەدا وەزیری ناوخۆی عێراق(مستەفا عومەری) بڕیاری لەسەرئەوەدا. کە ڕەگەزنامەی عێراقی لێ بسەنرێتەوە و لە وڵاتی عێراق بکرێتەدەرەوە. بەوەی کە کەسایەتیەکی عێراقی نییە. لە ڕێگای شێخ مەحمودی نەمرەوە کە لەودەمانەدا لە بەغدا لە ژێر چاودێریدابوو. بەهۆی هەوڵدانێکی ئەوەوە کەسایەتیەکی وەك سەید عەبدوڵڵای برازای سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوك هەوڵی بۆدا کە لە گوندی(ئەلبوسەباح) لای ڕەفعەت بەگی داوێ کە نزیك بوو لە شاری کەرکوکەوە بیشارێتەوە و پاش ئەو بیگوازێتەوە خانەقای سەید ئەحمەدی خانەقاو بەناوی خواستراوی(مەلا برایم) ەوە بۆ ماوەی ساڵێك لەوێ بمێنێتەوە لە ساڵی١٩٤٠بەدواوە و کەلەوێش ئاشکرابوو دووبارە گوێزرایانەوە بۆ گوندی(گۆپتەپە)ی ئاغجەلەرو بۆ ماڵی شێخ عەبدوڵڵای باوکی شەهید عەلی عەسکەری بەڕادەیە تا کاتی بەرپابوونی شۆڕشەکەی عەسکەری بەڕادەیە کاتی بەرپابوونی شۆڕشەکەی ڕەشید عالی گەیلانی کە لە مایسی١٩٤١ ڕوویدا لەوێ مایەوە و هەر لەوکاتەشدا دەرفەتێك بۆ شێخ

مەحمودی نەمر هەلکەوت کە بتوانێ لە بەغداوە هەڵبێ و لە ناوچەی گەرمیان و دەوربەری شاری کفرییەوە خۆی بگەیەنێتەوە کوردستان و مامۆستا هەمزەعەبدوڵلاش هەر لەو سەروبەندەداو لەکاتی بەرپابوونی ئەوشۆڕش و ڕاپەڕینەی ڕەشید عالی گەیلانیدا توانی بۆ جارێکی‌دی بچێتەوە شاری کەرکوك و لە ماڵی سەید ئەحمەدی خانەقادا بمێنێتەوە واتە تائەو کاتەی لە ساڵی۱۹٤۳بەدواوە ڕێگەی بۆ فەراهەم و مەیسەربووبێ کە خۆی بگەیەنێتە شاری مەهاباد لە کوردستانی ڕۆژهەڵات.[٩]

---

[٩] ئەم باسە لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٩٤٠)ی ١٩٩٩/٩/٥دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی هەشتەم

## هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق و ڕاپەڕینی بەردەرگای سەرای ١٩٣٠

لەو کاتەوەی کۆنگرەی قاهیرە لە١٢-١٨ئازاری١٩٢١ بەسترا. حکومەتی بەریتانیا لەودانیشتنەدا بڕیاری لەسەر ئەوەدا فەیسەڵی یەکەم(١٨٨٥-١٩٣٣) بکاتە شای عێراق و ئەم بڕیارەی بەتەواوی لە(٢٣ی ئابی١٩٢١)ەوە هێنایەدی دوا بەدوای ئەوەش یەکەم حکومەتی عێرا ق بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان نەقیب(گەیلانی) پێك هێنرا و، بەپێی ئەوە دەسەڵاتدارانی بەریتانیا کەوتنە ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ چەند ڕێکەوتنامەیەکی ڕەسمی لەگەڵ ئەم حکومەتەدا مۆر(واژۆ) بکەن. هەر چەندە بەریتانیا بەپێی سیستەمی(ئینتداب) کە(کۆمەڵەی گەلان) وەك ڕێکخراوێکی جیهانی ئەو کاتە دانی پیادا نابوو. وڵاتی عێراقی کەوتبوە ژێر دەسەڵاتەوە بەڵام هەر لە ساڵی(١٩٢٢)ەوە بۆ ٣٠حوزەیرانی١٩٣٠و لەو ماوەیەدا چەند ڕێکەوتننامەیەکی یەك لەدواییەکی تیا گەڵاڵەبوو. لەنێوان عێراق و بەریتانیادا بەجۆرێ بنەماکانیان زیاتر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا و مانەوەی سەربازی و سیاسەتی بەریتانی لە عێراق و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا فەراهەم دەکرد، سەرەڕای کە کردنەوەی ئەو ناڕەزاییانەی گەلانی بەریتانیا کە بەدەس فراوانخوازیانەوە بەردەوام لە گۆڕێدابوو. ئەمەی دوایشیان

واتە(٣٠حوزەیرانی١٩٣٠) بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەکی تەواو جەختی لەسەرمانەوەی بەریتانیا دەکرد لە عێراقدا، بەمەرجێك حكومەتی عێراقیش پشتگیری لەو بەردەوامی و مانەوەی بکات. ئەمەش نارەزایی یەکی گەورەی لە ناو گەلانی عێراق و بە کوردستانی پێکەوە گرێ دراویشەوە دروست کرد. کەواژۆ کردنی ڕێکەوتنامەیەکی لەو بابەتە جۆرێکە لە داگیرکردن و بەستنەوەی عێراق بە سیاسەتی داگیرکاری بەریتانیاوە. هاوکات ئەو ڕێکەوتنامەیە لەو(١١)یازدە بەندەیدا کە لەنێوان نوری سەعیدی سەرەك وەزیرانی عێراق و(هەمفرێزەر)ی نوێنەری بالای بەریتانی لە عێراق و لە(لەندەن) واژۆ کرا. تیایدا بە هیچ جۆرێك باس لە کورد و مافی نەتەوایەتی گەلی کورد نەکرا، لە کاتێکدا بەریتانیا خۆی پێشتر ئەو بەلێنەی دابوو کە ئیدارە و دەسەلاتێکی کوردی لە ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی عێراقدا پێك بهێنرێ لەگەڵ ئەوەشدا هەموو دەزگاکانی(کادیرانی کورد) و لەلایەن کورد خۆیەوە بەڕێوەببرێ. جێبەجێ نەکردنی بەلێنێکی ئەو تۆش وای کرد کە دانیشتوانی ناوچە کوردنشینەکان بەرامبەر بەڕێکەوتنامەکە نارەزایی خۆیان دەربڕن سەرەڕای بەرزکردنەوەی چەند گەلالە نامەو داواکاری و نارەزایی بۆ(کۆمەڵەی گەلان) و نوێنەری بالای بەریتانی لە عێراق ئەوە بوو ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق دوابە دوای ئەمەو، بۆ هێور کردنەوەی ڕقی دانیشتوان لە(٥)ی ئابی ١٩٣٠ەوە بڕیاریدا وەفدێك بنێرێتە ناوچە کوردنشینەکان بەمەبەستی دانانی پلانێك بۆ مەسەلەی هەڵبژاردنی(پەرلەمانی عێراق) کە دەبوو بنەماکانی ڕێکەوتنامەی١٩٣٠(عێراقی -بەریتانی) بخرێتە بەردەم ئەندامانییەوە بۆ بڕوا پێدان(مصادقە) و لەلایەن نوێنەرانی گەلەوە ڕەوایەتی تەواوی پێ ببەخشرێ، دوای ئەمەش جەعفەر عەسکەری وەك وەکیلی سەرۆك وەزیرانی

عێراق و، وەزیری ناووخۆو دادوەری كە(جەمیل مەدفەعی) و (جەمال بابان) بوون لەگەڵ(مێجەر یانگ)ی وەكیلی نوێنەر(مندوب)ی باڵای بەریتانی لە عیراق سەردانی شارەكانی كوردستانیان كرد هەر یەكەو وتارێكیان لەبارەی ڕێكەوتنامەكەو چۆنێتی واژۆكردنیەوە بۆدانیشتوان خوێندەوە بەڵام ئەمە لە شارێكی وەك سلێمانی و لە ٩ی ئابی١٩٣٠دا بە ئەوپەڕی توندییەوە لەلایەن دنیشتوانەوە كە لە بەردەرگای سەرای شاردا كۆبوونەوە بەرپەرچ درایەوە لە كاتێكیشدا مانگی ئەیلولی١٩٣٠نزیك بووەوە، حكومەتی عێراق بڕیاری لەسەر ئەوە دابوو كە دەبێ ڕۆژی ٦ی ئەیلولی ئەوساڵە پرۆسەی هەڵبژاردنەكانی پەرلەمانی عێراقی تەواوی جێبەجێ بكرێ بۆ ئەو مەبەستەش كەوتە ڕەنگ ڕێژكردن و، زەمینە خۆشكردن بۆ ئەوەی لە كاتی خۆیدا پرۆسەكە یەكلایی بكرێتەوە لەم ماوەیەشدا كەسایەتیەكی وەك شێخ مەحمود لە گوندی(پیران)ەوە زۆر بە وردیەوە لە تەواوی بارودۆخەكەی ئەڕوانی، چونكە بەپێی ئەوڕێكەوتنامەیەی كە لە١٩ای كانوونی دووەمی ١٩٢٧دا لەگەڵ حكومەتی عێراقدا واژۆی كردبوو نەدەبوو جارێكی دی دەستبداتەوە شۆڕشكردن، لە هەمانكاتا پیاوانی ناسراوو كەسایەتی بەرووناكبیرودیارەكانی شاری سلێمانی و، تەنانەت بەشێكی گەورەی دانیشتوانی شار بڕیاریان لەسەر ئەوەدابوو بەهیچ جۆرێك بەشداری پرۆسەی هەڵبژاردنە كە نەكەن هەر چەندە كاربەدەستان خەڵكیان ئاگاداركردبوەوە لە چۆنێتی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن و، بەشداربوون، سەرەڕای كۆنترۆڵكردنی سەراو دەوروبەری بەهێزی سەربازی بۆ ئەوەی هیچ پێكدادان و ڕووبەڕووبوونەوەیەكی چاوەڕوان كراو لەلایەن ئەوانەی كە لە بەردەم سەرای سلێمانی كۆبوونەوە و هێزەكانی دەوڵەتداڕوونەدات، كەچی ڕقی پۆڵاین و نیشتمان پەروەری جەماوەری سلێمانی بەتەواوی ئەو گۆمە مەنگەی شەڵەقان و تەقەدروست

بوو، بەجۆرێکی ئەوتۆ وای لەکاربەدەستان کرد کە هێزی زیاتر بەهەموو جۆرە چەکێکەوە بگەیەننە شوێنی ڕووداوەکەو زیاتر کەوتنە کوشتاری خەڵك، لە ئەنجامی ئەوکارە ناڕەوایەشدا کەدەسەڵاتدارانی عێراق، بەرامبەر بە دانیشتوانی سلێمانی و جەماوەری ڕاپەڕیووی ئەوشارە بەکاریان هێناو بەگوێرەی تۆمارکردنی هەندێ لە سەرچاوەمێژووییەکان. زیاد لە (٢٥)بیست و پێنج کەس شەهیدبوون و(٣٥) سی وپێنج کەس بە بریندار بەرکەوتن، سەرەڕای دەسگیرکردنی نزیکەی(٣٠٠)کەس کە زۆریان لە کەسانی ڕووناکبیرو ناسراوی شاربوون. سەرەڕای کوژران و برینداربوونی ژمارەیەك لەو هێزانەی حکومەت کە لەو ڕۆژەدا بۆ فڕکردنی خەڵك کۆی کردبوونەوە ئەوانەشی کە شەهیدبوون لەم ڕاپەڕینە جەماوەرییەی ئەیلولدا بەزۆری بریتی بوون لەکەسانی وەك:(حەمەقالە ئاغا، عەزیزی کورتان دروو، حەمەچاوشین، مەحمەدی خولە، عەول مەحمەدی چایچی کەبە(عەولەسیس ناسرابوو)، ئەحەڕەشەی حەسەنی دەروێشی شیرگەڕ، عەلی سیوجگەر فرۆش، عەزیز پینەچی، مستەفا فەتاحی کوڕی حاجی ئەحمەدی کەریم ئاغا...) بەجۆرێ هەر ئەو تاوان و سیاسەتەی حکومەتی عێراق و بەریتانیابوو کە ئەم ڕۆژەی لە ناو دانیشتوانی شاری سلێمانی و کوردستاندا بەڕۆژی ڕەشی ٦ی ئەیلول ناوزەدبکرێ و ئەوانەشی کە بەبۆنەی ئەم ڕاپەڕینەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە دەسگیرکران بەزۆری کەسایەتیە ناسراوەکانی وەك:(شێخ قادری برای شێخ مەحمودی حەفید، حەمە صاڵح بەگی عەلی بەگ، عەزمی بەگی بابان، ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا، عیزەت بەگی کوڕی وەسمان پاشای جاف، حەمە ئاغای کوڕی عەبدول ڕەحمان ئاغا، شێخ مەحەمەد گوڵانی، مەجید ئەفەندی کانی ئاسکان، فایەق بەگ، میرزا تۆفیقی قەزاز، فایەق بێکەسی شاعیر، ڕەمزی فەتاح، مستەفا مەولود لە هەندێ شوێنیشدا

ناوی ڕەفیق حیلمی بە ناوبانگ دێت. سەرەڕای کۆمەڵێك کەسایەتی تر کە ئەمانەش بۆ خۆیان بوونە ڕووداو کارەساتێکی خوێناوی وا کەدەیان شیعرو پەخشان و نووسینی دانسقەی لەلایەن شاعیران و ڕووناکبیرانی وەك:(بێکەس، ئەحمەد حەمدی ساحێبقران، پیرەمێرد، ئەخۆڵ و دواتریش گۆران)ەوە لەسەر تۆماربکرێ و، هەمووشیان بە هەستی نیشتمان پەروەری و کوردایەتی خۆیانەوە تەعبیریان لەو ڕۆژەو لەو کارەساتە خوێناوی یە کردووە وەك دەبینی ڕەنگدانەوەی کارەساتەکەش بە شێوەیەکی وا کاربەدەستان و دەسەڵاتدارانی ترساندووە کەوا لە وەزیری ناوخۆی عێراق(جەمیل مەدفەعی) بکا. نووسراوێکی ڕەسمی لە١٠ی ئەیلولی ١٩٣٠ و بە ژمارە(٢٩٨٠) بۆ شێخ مەحمودی ڕابەری شۆڕشی ڕزگاری خوازی کورد بەرزبکاتەوە و، ئەوەی بۆ ڕوون بکاتەوە کە ئەم کارەساتە نابێ واتان لێ بکا کە جارێکی تر دەس بدەنەوە شۆڕشکردن و ببێتە هۆی هەڵوەشانەوەی ڕێکەوتنامەی ١٩٢٧ی نێوانمان کەچی ئەم داواکاری و نووسراوە هیچ کارتێکردنێکی ئەوتۆی لای شێخ مەحمود نەهێشتەوە و شێرگیرانەتر کەوتە ئەوەی دووبارە پەیوەندی بکابە هەموو ئەوانەی پێشتر لە دەوری شۆڕشەکەی کۆبوونەوە هەر چەندە حکومەتی عێراق هەڵبژاردنەکەی بۆ ماوەی یەك هەفتە دواخست و دواتر ئەندامانی(سلێمانی) توانیان لەگەڵ ئەندامانی تری شارەکانی وەك کەرکوك، هەولێر و مووسڵ و لەیەکی تشرینی دووەمی١٩٣٠ لە ئاهەنگی کردنەوەی ئەنجومەندا بەشداربن لەگەڵ ئەوەشدا ناڕەزایەکانی گەلی کورد سەبارەت بە(٦)ی ئەیلولی سلێمانی هەر ئەوەندەنەبووە تەنها کار لە کەسایەتیەکی وەك شێخ مەحمود بکا بۆ خۆ ئامادەکردن و دووبارە دەسپێ کردنەوەی شۆڕش بەڵکو ڕووداوێکی لەو بابەتە وای لە ئەفسەرانی کوردی ناو سوپای عێراقی کرد ڕیزەکانی سوپا بەجێ بێڵن و خۆیان بگەیەننەوە ناوچە کوردنشینەکان

و، پەیوەندی بکەن بە شۆڕشەوە، وەك ئەوەی لەو کاتەدا وەزارەتی بەرگری عێراق نووسراوێکی بۆ وەزیری ناوخۆ بەرز کردەوە بە ژمارە(٢٠٠٦)ی ١١ی ئەیلولی ١٩٣٠تیایدا هاتووە:(ئەو سێ ئەفسەرەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە بێ ڕێگەدانیان یەکە(وەحدە)کانی خۆیانیان جێ هێشتوە ئەفسەرەکانیش بریتی بوون لەم سێ کەسایەتیە ناسراوانەی وەك:(سەرۆکی یەکەم مەحمود جەودەت، مولازمی یەکەم حەمید جەودەت ومولازمی دووەم کامیل حەسەن) و، لە نووسراوەکەی وەزارەتی بەرگری عێراقدا وای ڕوون کردۆتەوە کە گوایە ئەمانە لە(٧-٨) ئەیلولەوە لەگەڵ کەسێکی تردا بەرەوناوچە کوردنشینەکان ڕۆیشتوون هەر بۆیە وەزارەتی بەرگری دەسەڵاتی سەربازی لێیان ئاگادارکردۆتەوە کە دەستگیریان بکەن لەم کاتەش بەدواوە بووە شێخ مەحمود توانیویەتی بەهێزێکی گەورەوە ناوچەی پێنجوێن و دەوروبەری ئازاد بکا و بۆ جارێکی تر دەستبداتەوە شۆڕشکردن بۆ ڕزگار کردنەوەی هەموو ناوچەکانی تری کوردستان و بە ڕادەیەك ئەم جۆشدانی ئاگری شۆڕش و بەرگ دانەوەی درێژەی هەبووە تا ئەوکاتەی بە تەواوی توانیویەتی هێزەکانی خۆی بکەیەنێتەوە ناوچەی گەرمیان و تەنانەت یەکێ: لە مەبەستە سەرەکی یەکانی شێخ مەحمود لەم شۆڕشەیدا ئەوەبوو کە هەوڵی ڕزگارکردنی شاری کەرکوك بدا وەك ئەوەی لەو دەوروبەرەدا و لە سەرەتاکانی مانگی نیسانی١٩٣١دا توانی(شەڕی ئاوباریك)ی بە ناو بانگ دژی دەسەڵاتدارانی عێراق و حکومەتی بەریتانیای هاوکاری بەرپابکا.[10]

---

[10] ئەم باسە لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ) ژمارە(١٩٤١)ی، ڕۆژی دووشەممە ٦/ئەیلولی١٩٩٩دا بلاوکراوەتەوە.

# باسی نۆیەم

## ڕۆژنامە نووسی کوردی
## لەنێوان بنەماڵەی( بەدرخانی ) و ( موکریانی ) دا

بێگومان دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامە بە زمانی کوردی بە ڕووداوێکی گرنگ دادەنرێ لە مێژووی نەتەوایەتی کورد و مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردیدا. ئەمە لە کاتێکدا وپێش ساڵی ١٨٩٨ ڕووناکبیرانی کورد هەوڵی ئەومیان دابووکە ڕۆژنامەیەك بەزمانی کوردی بڵاوبکەنەوە بەڵام فەرما نڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی ئەوپەڕی قۆرتی گەورە و، کۆسپی گەورەیان بۆ دروست کردوون لە ڕێگای بڵاوبوونەوەیدا ئەمەش نەك تەنها بۆ کورد بەڵکو بەشێکی زۆری ئەو نەتەوانەشی گرتبوەوە کە لە ژێرسایە و دەسەڵاتی ئەواندابوون هەر چەندە نەتەوەکانی دی لەم لایەنەوە پێش ئێمەی کورد کەوتوون چونکە بارودۆخی سەرکوت کردن و قات و قڕی لە ناو ئەواندا لە ڕووی ئەواندا تاڕادەیەك ئەهوەنتربووە. هەر ئەمەش وای کردبوو کە گەلانی دیکەو نەتەوەکانی تر لەڕووی بەدەس هێنان و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەوە دەستی خۆیان بخەنەپێش و هاوکات بە زمانی زگماکی خۆیان بڵاوی بکەنەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە زۆر لەمێژوونووسان و ڕووناکبیران گەواهی ئەوەن کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە

تایبەتی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم بە ئەو پەڕی زۆرداریيەوە لە ڕووی پێشکەوتن وباری ڕووناکبیری خەڵکا ئەوەستا بەزۆری ئەمەشیان لەبەرئەوە بووە نەك نەتەوەکانی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتە ڕزیوەکەی ئاستی ڕۆشنبیری و وشیاریان بەرزبێتەوە وکاربکاتە سەر دەسەڵاتداریەکەی و، لە ناوچوونی هەر لەو سەروبەندەشەوە کە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لەوڵاتی میسردا پەرەی سەند و وڵاتی میسری ئەوکاتەش بۆ خۆی لە ژێر فەرمانڕوایەتی عوسمانی دابوو ئەم هاتنەی ئینگلیز بۆ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی و، ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وای کرد دەسەڵاتی سولتانی عوسمانی لە وڵاتی میسردا بێتە کزی و زەمینەش بۆ ئەوە خۆش ببێ کە چالاکی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانەی کە دژی بەسولتانی عوسمانی و(پیاوە نەخۆشەکە) واتە دەوڵەتی عوسمانی هاتبوونە کایەوە گەشەکردنی زیاتر بەخۆوەببینن، چونکە هەر لە ساڵانی ١٨٨٢-١٨٨٣بەدواوە دەسەڵاتی سولتان لەوڵاتی میسردا تەنها بەناوبوو بەڵام وەك دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی ئەو پەڕی لە کەنارگیری و لاوازیوون دابوو بەجۆرێ دوای تێپەڕبوونی ئەو بارودۆخە بە چەند ساڵێك تاڕادەیەك هەلێکی لەبار بۆ ڕووناکبیرانی کورد هاتە کایەوە بۆ ئەوەی قاهیرەی پایتەختی میسر بکەنە ناوەند و شوێنێکی دیار بۆ چالاکی وبڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە بە زمانی کوردی بەتایبەتی لەلایەن بنەماڵەی بەدرخانی بەناوبانگ و، کە سایەتیەکی وەك میقداد مەدحەد بەدرخان پاشاوە کەتوانی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە ٢٢ی نیسانی ساڵی١٨٩٨ بەناوی (کوردستان)ەوە. لە چاپخانەی(هیلال) بڵاوبکاتەوە، بەشێوەی زاری کرمانجی ژووروو بەڵام گەیشتنی ژمارەکانی بۆ کوردستان و، ناوچەکوردنشینەکان گەلێك گران و ئەستەم بوو. هەرچەندە بەشێکی لە ڕێگای ڕێکخراوە سیاسیەکانەوە ئەگەیشتە ناوچە کوردنشینەکانی کوردستان و، کۆمەڵانی خەڵك و، ڕووناکبیرانی، نەوەدەمەی کورد وەك جگەر

گۆشەی خۆیان، لەباوەشیان دەگرت و، دەیانخوێندەوە. هەر لە سەرەتای دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیەوە عوسمانیەکان کەوتنە دژایەتی کردنی و بۆ ئەو مەبەستەش دەرامەتێکی زۆریان خستبوەکارەوە، بۆکپ کردنەوەی چالاکی ڕێکخراوە کوردیەکان و داخستنی ئەو ڕۆژنامانەی کە دژبە ئەوان و دەسەلاتەکەی ئەوان بلاودەکرانەوە. بۆ یە لەگەڵ تەنگ پێهەڵچنینی دەسەلاتدارانی عوسمانیدا ڕووناکبیرانی کورد وایان بەباش زانی کە دەرچوونی ڕۆژنامەکە بگوازنەوە ئەوروپا و، دوای دەرچوونی چەند ژمارەیەکی لە قاهیرە گواستیانەوە جنێف و، دواتر بۆ لەندەن و فۆلکستۆن و بۆ جارێکی دی جنێف. بەلام سەبارەت بەوەستان و دەرنەچوونی بەپێی بۆچوونی هەندێ لەڕووناکبیران وای بۆ دەچن: گوایە کار بەدەستانی ڕۆژنامەکە لەلایەن سوڵتانی عوسمانی یەوە قایلکرابوون بەوەی کە بلاوی نەکەنەوە، وەك دوابەدوای دەرچوونی کوردستان ڕۆژنامەیەکی تر لە لایەن: شێخ عەبدولقادری شێخ عبێدللای شەمزینییەوە لەئەستەمبوڵ بلاوکرایەوە بە ناوی(ڕۆژی کورد)ەوە و، هەفتانە بلاوکرایەوە پاشان(گۆڤاری کوردستان)ی ورمێ شوێنی گرتەوە، کە لە ساڵی ١٩١٢-١٩١٤ و سەرەتای بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەمی خایان و، لەلایەن ڕووناکبیری ناسراوی کورد عەبدولرەزاق بەدرخان پاشاوە بلاودەکرایەوە، دواتریش ئیسماعیل ئاغای سمکۆ(شکاك) ئەرکی دەرکردنی ڕۆژنامەی کوردی کەوتە ئەستۆوە وەك ئەوەی لەم ماوەیە بەدواوە گەلێك گۆڤار و ڕۆژنامە بەزمانی کوردی بلاوکراونەتەوە کە بەزۆری تەمەن کورت بوون و بەگرانیش دەردەکران(دیارە ئەمەش پەیوەندی بەباری ڕامیاری ئەوسەردەمەی گەلی کوردە وە هەبووە لەلایەك و، نەبوونی کادیر و ڕۆشنبیری ئەوتۆ کە بتوانێت بە شێوەیەکی بەردەوام ئەرکی بگرێتە ئەستۆو خۆی بۆ تەرخان بکا ـ ب نووسەر) هەر لەوکاتەشەوە کە ئینگلیزەکان وڵاتی عێراقیان بە کوردستانی

لەمەڕخشمانەوە داگیرکرد بۆ مەبەستی چەسپاندنی سیاسەتی خۆیان لەناوچەکەدا دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی گۆڤار و، ڕۆژنامە بەزمانی کوردی وەك: پێشکەوتن، تێگەیشتنی ڕاستی و دەنگی گێتی تازە و... تاد. هەریەکەشیان سەربەدەسەڵاتدارانی بەریتانیاو باڵوێزی بەریتانی بوون لە ناوچەکەدا. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیروڕووناکبیرانی ئەودەمانەی کورد چ بەشێوازی ئاشکراو بەناوی خوازراوەوە بابەت و، نووسینی خۆیانیان تیایاندا بڵاو دەکردەوە و هاوکات جێگای خۆشیان بەتەواوی لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا کردەوە. بە جۆرێ تا ئێستاش زۆر لە ڕووناکبیران و مێژوونووسان وەك سەرچاوە پشتیان پێ دەبەستن لە نووسنەکانیاندا شان بە شانی ئەمانەش لە ڕۆژگاری حکومداریەتی شێخ مەحمود لە شاری سلێمانی و دەرەوەی سلێمانیدا گەلێك گۆڤارو ڕۆژنامەی وەك: بانگی کوردستان، بانگی حەق و ئومێدی ئیستقلال بۆ خزمەت کردن کورد و، بوژانەوەی زمان و ئەدەبی کوردی هاتنەکایەی کۆمەڵگای کوردەوە و، ژمارەیەکی دیاریان لێ بڵاوکرایەوە تەنها ڕۆژنامەی(بانگی حەق) نەبێ کەتەنها(٣)سێ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە. بەڵام بەهۆی داگیرکردنەوەی کوردستان بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ و لە ناوچوونی دووەمین حکومەتی شێخ مەحمود لەلایەن بەریتانیاوە. هەموو ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانەش لە کاروەستان وتەنانەت ئەو چاپخانەیەش کە ڕۆژنامەکانی پێ چاپ دەکرا لەلایەن داگیرکەری بەریتانییەوە دە ستی بەسەراگیرا. لەو ماوەیەشەوە کە(پیرەمێرد)ی شاعیر بۆ یەکجارەکی گەڕایەوە کوردستان و، شاری سلێمانی، دەستیدایەکاری ڕۆژنامە نووسی و، بڵاوکردنەوەی، ڕۆژنامەی(ژین) کە بە یەکێك لە بە تەمەنترین ڕۆژنامە کوردییەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێ بەجۆرێ تاکاتی وەستانی بەسەریەکەوە نزیکەی(١٧٠٠)ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

لـە تـەوەری هـەولێر و شـاری(ڕەوانـدز) یشـدا ئـەوا بنەماڵـەی موكریـانی بـەناوبانگ و هـەردوو جوتـەبرا حسـین حوزنــی موكریـانی و گیـوی بـرای لەوانـەبوون كـە ڕۆڵ و تایبـەت مەندیـەكی بـەرچاویان لـەم بـوارەدا دیـوە، بەتایبەتی حسین حوزنی موكریانی یەكێكە لەو كەڵە ڕووناكبیرانەی كورد كە شوێن دەستێكی دیاری لەبەرەوپێش چوونی ڕەوتــی ڕۆژنامەنووسـی كوردیـدا هەیە چونكە دەركردن وبلاَوكردنەوەی(زاری كرمانجی) و(هەتاو) و هەموو ئەو كتێبە بە نرخانەی كە زیندووی كردوونەتەوە و بە چاپی گەیاندون ئەو پەڕی دیاردەی دڵسۆزی و وەفاداری ئەم پیاوە ئەسەلمێنێت بەرامبەر بەگەلی كورد و، مێـژووی ڕۆژنامەنووسی كوردی، وەك چۆن خۆی ئەوەمان بـۆ بـەیان ئـەوكاو چۆن بە هەڵەداوان بەدوای دامەزرانی چاپخانەدا سەرگەردان بووە بەمەبەستی خزمەتكردنی وشەی ڕەسەنی كوردی و لەبەرنەبوونی و دەس كورتی لەكەسانی تر پاڕاوەتەوە و داوای پارەی لێ كردوون بەقەرز بۆ ئـەوەی بتوانێ چاپخانەكەی پێ بخاتـەوە گەڕ و خزمـەتی پێ بكا وەك دەڵێ:" لەبەرئـەوە كـە لـە هـەولێر خەریكی دامەزراندنی مەتبەعە كەبووم هەر چەند كۆشام چارەیەكم نـەكرا كە هەندێك پارە دەست بخەم. كە بنێرم حروفات بكڕم. ناچاروتم دەچمە كەركوك و سلێمانی پارە پەیدا نەكەم و دەچمە بەغدا حروفات دەكڕم"(بڕوانـە: یاداشتی ڕۆژانەی حوزنی، هاوكاری، ژمارە"١٠٦٤"سەبارەت بـەباری ڕۆژنامەنووسی كوردی لە سەردەمی كۆمـاری كوردسـتان(مـەهاباد)دا و، لـەو مـاوە كەمـەی تەمەـنیدا گـەلێك گۆڤـارو ڕۆژنامـەی جۆربـەجۆر چـاپ و بلاَوكرانـەوە. لەوانـە(هەڵاڵـە) لەبۆكان،(نیشتمان)،(گڕوگاڵی منالَی كورد)،(ئاوات) و(هاواری كورد)... تـاد بـەلاَم هـەموو ئەمانـە لەگـەڵ لـە نـاوچوون دارمـانی ئـەو كۆمـارە ساوایەی كوردسـتاندا لـەبارچوون و، ئەوانەشی بـەرێوەیان دەبـردن و بلاَویـان دەكـردەوە پەرتـەوازەی وڵاتـان بـوون و هەندێكیشـیان گـیران و لەلایـەن فـەرمانڕەوایانی ئێرانـەوە لـە

سێدارە دران هەر چەند ئەمانە ئەوساو ئێستاشی لەگەڵ دابێ بە تەواوی لە مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردیدا جێگای خۆیان کردەوە ماوەتەوە بڵێین: هەزاران درودو ڕەحمەتی درەوشاوە بۆ گیانی ئەو کەسایەتی و، ڕۆژنامەنووسانەی کورد بنێرین کەلەم مەیدانەدا لە خەباتی بەردەوامدابوون، بەتایبەتی ڕۆژنامەنووسانی وەك: حوزنی موکریانی و گیو موکریانی، عەلائەدین سەجادی، ڕەفیق حیلمی، خەڵەف شەوقی و دەیان کەسایەتی تر لە کۆتاییشدا سەدان و هەزاران چەپکە گوڵی کوردەواری بۆ سەر گۆڕی میقداد مەدحەت بەدرخان پاشای نەمر و، هەمووئەوانەی لەکاری ڕۆژنامەنووسی کوردیدا خزمەتی وشەی پاك و ڕەسەنی کوردیان کردو، وەکو مۆم خۆیان بۆ درەوشانەوەی سوتاند."

" ئەم باسە لە ڕۆژنامەی(هاوکاری) ژمارە(١٣٠٧)ی ساڵی ١٩٩١دا بلاوکراوەتەوە.

# باسی دەیەم

## جارێكی تر
## چاپخانەی كوردستان لە قاهیرە١٨٨٨؟!

پێش چەند ساڵێك نووسینێكم بڵاوكردەوە سەبارەت بە(چاپخانەی كوردستان) لە قاهیرە تیایدا ئەوەشم ڕوونكردبوەوە كە ئەمەیان مێژووەكەی دێرینترە لە مێژووی دەرچوون وبڵاوبوونەوەی یەكەم ڕۆژنامەی كوردی(كوردستان) كە بۆ یەكەم جار٢٢ی نیسانی١٨٩٨و لە چاپخانەی هیلال ڕۆژی شەممە بڵاوكرابێتەوە لە كاتێكدا خاوەنی ئەو چاپخانەیەش كەڕۆژنامەكەی لێوەچاپكرابوو نووسەری ناسراوی عەرەب(جرجی زێدان) بووە. دیارە لێكدانەوە و ساغكردنەوەی من سەبارەت بەو چاپخانەیە كتێبێكی(ابن قتیبە)ی دینەوەرییە.لە بەڕەچەڵەك كوردبووە و لە ساڵی(١٣٠٦ك) بەرامبەر بە ساڵی١٨٨٨ز بەناوی(تأویل مختلف الحدیث)ەوە، لە(چاپخانەی كوردستان)ی وڵاتی میسر و لە شاری قاهیرە چاپكرابوو، بڕوانە، ڕێگای كوردستان،ژ(٣٠١). كە ئەمەش بۆ خۆی دەلالەتێكی تازە و هەوڵدانێكی تازەی ڕووناكبیرانی كورد دەسەلێنێت وەك گەل و نەتەوەیەك، كە هەر لە ساڵانی سەدەی نۆزدەیەمەوە ڕاگەیاندنەوە خۆی بەگەلان و

نەتەوەکانی جیهان بناسێنێت و شوناسنامەی ونبووی خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئەمەش دواتر برای ڕووناکبیر(مەحمەدی مەلا کەریم)م ئاگادار کردەوە. بەوەی کە ئەمە ڕووداوێکی تازە و هەوڵدانێکی تازەی ڕووناکبیرانی ئەوکاتەی کوردبووە، لەبواری چاپ و بڵاوکردنەوەدا، هەر دوا بەدوای ئەوە کاك مەحمەدیش بە نامەیەك ئاگاداری کردمەوە و گەلێك زانیاریی وتێبینی دانسقەی بۆ نووسیبوومەوە وەکو لە بەشێکیدا وتویەتی:(وەختی خۆی دوو مەلای زیرەکی کورد محی‌الدین صبری النعیمی الکانیمشکانی سنەیی و فرج الله زکی الکردی، چوونەتە میسر لەوێ لە چاپخانەیەکدا بە ناوی(مطبعة السعادە)وە گەلێ کتێبی مەلایانەیان چاپکردووە کە هەندێکشیان هی مەلایانی کورد بووە یەکێ لەوانە کتێبی(العقیدە المرضیة)ی مەولەوی خۆمانە، کە کوردیەو شیعرە، دوورنییە ئەم چاپخانەیە هەر(کوردستان)ە پێشووەکە بووبێت و لەبەر هەر هۆیەك بووە ناوی گۆڕابێت" هەر لەم ماوەیەدا و هەر لە ڕێگای مامۆستا مەحمەدی مەلا کەریمەوە بۆ جارێکی دی سەبارەت بە چاپخانەی کوردستان بەرگی کتێبێکی چاپکراوم پێگەیشت کەکاتی خۆی هەر لەو چاپخانەی(کوردستان)ەوە چاپکراوە و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گومانی ئەوەی لانەهێشتووینەتەوە کەبێ چەندوچوون بڵێین: چاپخانەیەك هەبووە لە قاهیرەی وڵاتی میسر ناوی(کوردستان) بووە و خاوەنەکەشی ڕووناکبیرێکی ئەوکاتەی کوردبووە بەناوی(فرج اللە زکی الکردی) وەك کاك(مەحمەدی مەلا کەریم) پێشتریش لەنامەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەمەیان کردبوو، ناو نیشانی ئەم کتێبەی دوایی لە دانانی(أبی حامد الغزالی)یەو وەك لەسەر بەرگەکەی دانووسراوە:" کتاب میزان العمل للامام الهمام حجة الأسلام أبی حامد محمد ابن محمد الغزالی المتوفی سنه٥٠٥، طبع

على نفقة حضرات الأفاضل الشيخ محى الدين صبرى الكردى والشيخ عبدالقادر معروف والشيخ محمد حسين نعيمى" پاشان لە پەراوێزی بەرگی(کتێب)ەکەوە نووسراوە :(طبع بمطبعة كردستان العلمية لصاحبها فرج الله زكى الكردى بمصر سنة١٣٢٨) ڕەنگە بەپێی مێژووی چاپکردنی ئەم دوو کتێبە بێت کە لە چاپخانەی کوردستانەوە چاپکراون کەیەکەمیان لە ساڵی(١٣٠٦ك) و دوومیان ساڵی(١٣٢٨ك)ەو هاوکات لەگەڵ ساڵی(١٨٨٨ز) و(١٩١٠ز)دا. بەتەواوی ئەوەمان بۆ ساغ نەبێتەوە، کە سەرەتای دامەزرانی ئەم چاپخانەیە کە دەقاودەق ساڵی چەند دامەزراوە. بەڵام ئەمەی دواییان بەتەواوی ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە کە ئەم چاپخانەیە تا ساڵی١٣٢٨کۆچی واتە ١٩١٠ی زاینی ماوەتەوە و هەر چیەکی چاپ کردبێت. هەر بە ناوی چاپخانەی(کوردستان)ەوە بووە. خۆ ئەگەر ئەم نووسینەش گەڕان و پشکنینی تازەتری بەدوادابێت(وەکو پێشتریش وتومە) ئەوا هیچ گومانی ئەوەمان لاناهێڵێتەوە کە(چاپخانەی کوردستان) لەچ ساڵێکدا دامەزراوە و پێشتر چەند کتێب و نووسینی تری بلاوکردۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا من وای بۆ دەچم کەئەمەشیان کارێکی زۆر ئاسان بێت. چونکە کچی ئەو (فرج الله زكى الكردى)یەی کەخاوەنی (چاپخانەی کوردستان) بووە. ناوی (بەهیە)یەو بەپێی بۆچوونی کاك محەمەدی مەلا کەریم تا ئەم ساڵانەی دواییش لەمیسر دەژیو زۆر بەئاسانی دەتوانرێت لەڕێگای ئەو ڕووناکبیرە کوردانەی کەلەقاهیرە دەژین، یا ئەو نووسینگانەی دەرەوەی حیزبە کوردستانییەکان کەلەوڵاتی میسرو لەقاهیرە ناوەندی تایبەت بەخۆیان هەیە. دەتوانرێ سۆراخێکی جیدی ئەم مەسەلەیە بکرێو زانیاری تازەترو نوێتری لەبارەوە ساغ بکرێتەوە. خۆ لەکاتێکیشدا ئەمەیان نەکرێو (بەهیە) خانی کچی

(فرج الله زكى الكردى) نەمابێت‌و وەفاتی کردبێت. ئەوا دەبێ پەنا بۆ ئەو کتێبانە ببرێ کەلەسەر (مێژووی چاپخانەکانی میسر ـ تأريخ المطابع في مصر)ن. بەتايبەتی ئەو چاپخانانەی کەلە قاهیرە دامەزراون. هەرچەندە ئەوەشمان لاڕوون نییە ئاخۆ ئەم چاپخانەیە کتێبی بەزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە یان نا. یان هەموو ئەو نووسین‌و بابەت‌و کتێبانەی کەلێرەوە بڵاوبوونەتەوە هەرهەموویان بەزمانی عەرەبی بوون.

*ئەم باسە لەرۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (٢٤٥٥)ی ٢٠٠١/٥/١٧دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی یازدەیەم

## مەزاری سەی سۆنە لەنێوان راستیو ئەفسانەدا*

لەكاتی سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلامداو گەیشتنی بۆ ناوچە كوردنشینەكان، بەتایبەتی لەسەردەمی خەلافەتی راشدی (١١ك ـ ٤١ك)داو، لەكاتی فەرمانڕەوایەتی خەلیفە عومەری كوڕی خەتابدا ساڵی (١٨ك) بەرامبەر بە(٦٣٩ز)ی گەیشتۆتە كوردستان (دكتۆر كەمال مەزهەر، مێژوو، ل١٥٢) ئەم ماوەیەش بۆخۆی دەكەوێتە ساڵانی دوای وەفاتی پێغەمبەرەوە (١١ك) بەرامبەر بە(٦٣٢ز)ی (مسيرة الحضارة، مجلد الاول، ص ٣٢٤). لێرە بەدواوە بەزۆری دانیشتوانی ئەم هەرێمە بنەما سەرەكییەكانی ئەم ئایینە تازەیان قبوڵ كردووەو، لەسەری رۆیشتوون، لەم ماوەیەشەوە ئایینی ئیسلام بەهەموو بنەماكانییەوە وەك نەریتێكی كۆمەڵایەتی لەنێوەندی گەلی كوردو كۆمەڵگەی كوردەواریدا جێی خۆی كردۆتەوە شان بەشانی ئەم بیروڕایەو بڵاوبوونەوەی ئەم بیروڕا نوێیە. گەلێ زاناو بیریارو رووناكبیری ئیسلامی بەنەژاد كورد هەڵكەوتوون. هەریەكەشیان لەژێر ئەو كارتێكردنو تایبەتمەندییەی ئیسلامدا پێگەیشتوونو خزمەتیان بەمرۆڤایەتیو ئایینی ئیسلام كردووە. وێڕای سەرهەڵدانی چەندین رێبازو تەریقەتی هەمە جۆر

کەهەریەکە بۆ خۆیان بنەماو خەسڵەتە سەرەکییەکانیان لەئیسلام‌و بیروڕای تازەوە وەرگیراوەو، بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوە، لەوانە ڕێبازو تەریقەتەکانی قادری‌و نەقشبەندی لەناو ڕێبازی سونەداو، عەلی ئیلاهی، خاکساری‌و چەشتی.. تاد. لەناو ڕێبازی شیعەدا. لەگەڵ ئەوەشدا دەیان تەکیە، خانەقا، مزگەوت‌و ناوەندی ئایینی ئەوتۆیان کردۆتەوە کەببنە جێگای کۆڕو کۆڕبوونەوەو بڵاوکردنەوەی بیروڕاکەیان بەشێوازێکی فراوانترو تۆکمەتر بەڕادەیەك وای لێهاتووە زۆرجار ئەم کەسایەتیانە سەربردەو بۆچوونی ئەفسانەییان بدرێتە پاڵ‌و تا ئەم سەروبەندەش وەك لێکدانەوەیەکی ئەفسانەیی باسیان لێوە بکرێ.

یەکێ لەو کەسایەتییانەش لەناوچەی گەرمیاندا، بەدرێژایی مێژووی بۆتە وێردی سەرزمانی دانیشتوانی ناوچەکەو سەردانی دەکەن مەزاری (سەی سۆنە)یەو دەکەوێتە خۆرئاوای شاری کەلارەوە.. وەك بەشێکی زۆر لەبەساڵاچووانی ناوچەکە قسەی لەسەر دەکەن کەگوایە ئەم (سەی سۆنە)یە ئافرەت بووەو ناوی ڕاستی (سەید سەوسەن) بووەو، دەبێتە خوشکی (سەید خەلیل) کەئەمڕۆ مەزارەکەی دەکەوێتە هەمان گوندی (سەید خەلیل)ەوە کەبەناوی ئەوەوە ناونراوەو لەباکوری شاری کەلاردایە.

سەبارەت بەحەقیقەتی (سەی سۆنە) یا(سەید سەوسەن). هەردانیشتوانی ناوچەکە وای دەگێڕنەوە، ئەم مەزارەی کەئەمڕۆ دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری کەلاری ئێستاوە، گۆڕی (سەی سۆنە) نییە بەڵکو گۆڕەکەی دەکەوێتە هەمان گوندی (سەید خەلیل)ەوە کەپێشتر باسم لێوەکردو دەڵێن: براو خوشکی یەکتر بوون‌و، وەك سەربردەو چیرۆکێکی ئەفسانەیی وای باس لێوە دەکەن کە(سەی سۆنە) لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی خەلیفەی عەباسی هارونە ڕەشید (١٤٥ك ـ ١٩٤ك)و لەساڵانی سەید قڕاندا، هەریەکە لە(سەید خەلیل)و

(سەید سەوسەن)ی خوشکی کەوتوونەتە ئەم ناوچەیەوە، بەپێی ئەم بۆچوونەش بێت، ئەگەر خەلیفەی عەباسی هارونە رەشید لەساڵی ١٤٥ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی ٧٦١ی زایینی لەدایك بووبێ (الشیخ محمد الخضری بگ، تأريخ الامم الاسلامية، القاهرة، ص١٠٢)و لەساڵی ١٧٠ی کۆچی بەرامبەر بە٧٨٦ی زایینیو، دوای مردنی براکەی خەلیفە هادی دەسەڵاتو خەلافەتی عەباسی گرتبێتە دەستو دواتر لەساڵی ١٩٤ی کۆچی بەرامبەر بەساڵی ٨٠٨ی زایینی لەخۆراسان کۆچی دوایی کردبێ (هەمان سەرچاوە، ل١٠٢) ئەگەر سەرچیغ نەچووبێتم ئەوا تەمەنی یاخود بڵێین ماوەی سەرهەڵدانی (سەید سۆنە) بۆ ناوچەی گەرمیانو دەوروبەری کەلاری ئێستا ئەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (١٢٦٠) ساڵی پێش ئێستا. وەك دەشگێڕنەوە سەربردەی ئەم سەید قرانە (ئەفسانە بێت یاڕاست) لەوەوە هاتووە کەلەسەردەمی خەلیفە هارونی عەباسیدا پیاوێکی هەژار دەچێتە لایو باسی هەژاریو بێ دەرمەتانی خۆی بۆ دەکا. خەلیفەش تەزبیحە گران بەهاکەی خۆی بۆ دەکاتە دیاریو دەیداتە پیاوە هەژارەکەو پێی دەڵێ: (دەتوانی لەبازاڕدا بیفرۆشیتەوەو پێداویستییەکانی خۆتی پێ دابین بکەی) کاتێ پیاوی هەژار تەزبیحەکە دەباتە بازاڕو بەمەبەستی فرۆشتن لەوکاتەدا جوولەکەیەکی لێ ڕاست دەبێتەوەو پێی دەڵێ: ئەو تەزبیحە هی منەو دزراوە، تۆ لەکوێت هێناوە، پیاوی هەژاریش زۆر دەپاڕێتەوەو، باسی ئەوەی بۆ دەکا کەخەلیفەی عەباسی هارونە رەشید بۆی کردۆتە دیاری، سوودی نابێ، بۆیە جوولەکەکە لەدادگا شکات لەهەژارەکە دەکاو دەیداتە دادگا. بەو جۆرە رۆژی دادگایی کردن، جولەکەکە مێزەرێکی سەوز لەسەردەنێو دەڵێ: من سەیدمو ئەو تەزبیحەش هی منە، کاتێ خەلیفە بەمە دەزانێ بەخۆی دەچێتە دادگاو بەجولەکەکە

دەڵێ: بەچیا دەزانی ئەوە تەزبیحی تۆیە، ئەویش وەڵامی دەداتەوە هی منەو دزراوە، بۆیە خەلیفە سندوقێك دێنێو نزیکەی (٣٠) تەزبیحی تری لەو بابەتە دەخاتە ناویەوە. داوای لێدەکا کەتەزبیحەکەی لەناو ئەوانی دیدا بدۆزێتەوە، جوولەکەکەش دەڵێ: ئەمانە هیچیان هی من نین، خەلیفە هارونیش پێی دەڵێ تۆ درۆدەکەی، دووبارە دەسی ئەکاتە ناو سندوقەکەداو تەزبیحەکە دەردەهێنێتەوەو پێی دەڵێ: ئەوەیان تەزبیحەکەی پێشووە، هەر لەهەمان کاتدا خەلیفە بڕیار دەدا. مادام سەید درۆی کردووە، ئەبێ هەرچی سەید هەیە بکوژرێت، بۆ ئەو مەبەستەش دەستە سەرباز دەنێرێ بۆ ئەوناوچانەی کەلەژێر دەسەلاتیا بوون، بەمەرجێ هەرهەموویان دەسگیر بکرێنو لەوڵات دوور بخرێنەوە. بۆیە زۆربەی سەیدەکانی ئەوکاتە لەناوچەو شوێنی خۆیان هەلاتوونو لەتاو ئەو بڕیارەی خەلیفە پەرتەوازە دەبن. بەم جۆرەو هەر لەم دەکانەشدا بووە کەهەریەك لە(سەید خەلیل)و (سەید سەوسەن)ی خوشکی کەوتوونەتە ناوچەی گەرمیانو کەلارەوەو شوێنی پێشووتریان تائێستا نەزانراوە. پاشان کەخەلیفە هارونە رەشید ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێ کەکابرای بەردەم دادگا جوولەکە بووەو بەساختە خۆی کردبووە سەید. دووبارە بڕیاری لێبوردن بۆ هەموو سەیدەکان دەردەکا، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە سەر شوێنو ناوچەی خۆیان. ماوەتەوە بڵێین: مەزاری (سەی سۆنە)ی ناوچەی گەرمیان تائێستاش خەڵك بۆ مەسەلە ژانو باو بۆیەکێك بیەوێ بۆ ئیشێك یا داواکارییەك مەرازی بێتە دی سەردانی دەکەن. سەرەڕای ئەوەی لەوەرزی بەهارو کاتی گەشتو گوزاریشدا زۆر لەخەڵکی ناوچەکەو دەوروبەری دەچنە (سەی سۆنە)و کاتێکی خۆش بەسەردەبەن.

*ئەم بابەتە پێشتر لە(ڕێبازی ئازادی) ژمارە (٢٢٨)ی ٢٠٠٠/٢/٢٠دا بلاوکراوەتەوە.

# باسی دوازدەیەم

## دەنگی كورد لەكۆنگرەی سان ـ فرانسیسكۆی ئەمەریكی دا ١٩٤٥*

هەر لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی (١٩٣٩ ـ ١٩٤٥)دا وڵاتانی هاوپەیمان كەوتنە ئەوەی ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی بۆ ئاسایش‌و بێوەیی وڵاتانی پاش جەنگ دابمەزرێ. بەمەرجێك كارەكانی لەو چوارچێوەیەدا نەگیرسێتەوە كەوەك ڕێكخراوی كۆمەڵەی نەتەوەكان (عصبة الأمم)ی لێ بێت. بەڵكو ڕێكخراوێكی جیهانی ئەوتۆ بێتە كایەوە سنورێك بۆ یاسای نێودەوڵەتی‌و ئەو قەیرانە نێودەوڵەتییانە دابنێ كەتائەو كاتەش زۆربەی گەلان‌و وڵاتانی دونیا بەدەستیەوە دەیانناڵاندو گیرۆدەی كارەسات‌و دەرەنجامە ترسناكەكانی دەبوون. هەربۆیە هاوپەیمانان. هێشتا جەنگی دووەمی جیهانی كۆتایی نەهاتبوو كەوتنە تاووتوێ كردن‌و لێكدانەوەی دامەزراوێكی نێودەوڵەتی. بۆ ئەو مەبەستەش سەرانی ئەو دەمەی هاوپەیمان چەند دانیشتنێكیان بۆ ئەو مەبەستە كرد. كەیەكەمیان: لەو كۆنگرەیەوە دەستی پێكرد كەلەمیوانخانەی (دەمبەرتن ئۆكس)ی سەر بەویلایەتی (واشنتۆن)ی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەسترا، كۆمەڵێك لەسیاسەتمەدارو پیاوانی دیپلۆماتی وڵاتانی هاوپەیمانی وەك: ئەمریكا، بەریتانیا، یەكێتی سۆڤیێتی پێشوو (١٩٢٢ ـ ١٩٩١)و چین تیایدا بەشداربوون ئەوەش بۆخۆی لەڕۆژی ٢١ی ئاب تاوەكو ٧ی ئۆكتۆبەری ساڵی

١٩٤٤ی خایاند. دوابەدوای ئەوە دانیشتنی دووەمیان: ئەو کۆنگرەیان بوو کە لە (یالْتا)ی سەردەریای رەش‌و (یەکێتی سۆڤێت) بەستیان‌و لەرۆژی ٤ ـ ١٩٤٥/١١/١١ی خایاند. لەم دانیشتنەشدا ئەندامانی کۆنگرە لەسەر مەسەلەی بەکارهێنانی مافی (ڤیتۆ)ی وڵاتانی ئەنجومەنی ئاسایش‌و بەستنی کۆنگرەی سێیەم واتە کۆنگرەی دامەزران‌و بەیاننامەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان رێکەوتن کەلە ٢٥ی نیسانی ساڵی ١٩٤٥ ببەسترێت. ئەوەبوو لە٢٦ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا ئیمزا لەسەر بنەماکانی رێکخراوەکەدا کراو ئەو وڵاتانەش کەڕاگەیەنراوی رێکخراوی نێودەوڵەتیان لەو کۆنگرەیەدا مۆرکردو، پاڵپشتیکەری بەلگەنامەکانی بوون. خۆیان دەدا لەنزیکەی (٥١) وڵات. بەجۆرێ وڵاتانی: عیراق، ئێران، تورکیاو سوریا لەو وڵاتانە بوون، کەهەریەکەو رێژمیەکی گەورە لەکوردو وڵاتانی کوردیان بەسەرا دابەشبببوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆنگرەی دامەزرانیشدا رەوایەتی بەشداربوونیان بەرکەوتبوو. بەڵام لێرەدا لایەنێکی گرنگ هەیە دەبێ باسی لێوەبکرێ، ئەوەشیان سەبارەت بەکوردو، بەگەیشتنی داواکاری کوردە لەو کۆنگرەیەدا کەپێویستی تەواوی بەلێکدانەوەو بەدواداچوونی گونجاو هەیە، ئەوەش بۆ خۆی دەنگی رەوای گەلی کورد بووە بۆ ئەو کۆنگرەیەی کە لەو دەمانەدا لەشاری (سان فرانسیسکۆ)ی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بەسترا. تائێستاش ئەو داواکاری‌و بەشداربوونەی کورد بەشێوەیەکی شاراوە ماتەوەو نازانرێ ئەو نوێنەری کورد ئەو داواکارییەی کەبەناوی کوردەوە گەیەنراوەتە کۆنگرەکە کێ گەیاندویەتی هەرچەندە باسیل نیکیتین لەکتێبەکەیدا (الأکراد) کە کاتی خۆی لەسەر کوردان بڵاوی کردۆتەوە، ئاماژەی بەوە کردووە کەلەساڵی ١٩٤٥ داو، لەکاتی بەستنی کۆبوونەوەکانی دەستەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا لەشاری سان فرانسیسکۆی سەر بەویلایەتی کالیفۆرنیای وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا: لیژنەیەکی کوردی توانیویەتی لەکاتێکی

گونجاودا فرسەتی ئەوە بەدەسبێنیو وتارو یادداشتنامەیەك بۆ ئەنجومەنی کۆنگرەکە بەرز بکاتەوە لەگەڵ خستنە پێش چاوی نەخشەیەکدا کەداواکارییەکانی خۆی لە(کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ)دا خستبووە بەردەس. وەك لەبەشێکی دەقی یاداشتنامەکەدا هاتووە: ئاشتی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرقەرار نابێ تاوەکو چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد نەدۆزرێتەوە (بڕوانە، نیکیتین، الاکراد، بیروت، ص١٩٠). ئەمە خۆی لەخۆیدا داواکاریو بیرکردنەوەیەکی وشیارانەی نوێنەرانی گەلی کورد بووە. بۆ ڕۆژگارێکی وا کەدەنگی خۆی بگەیەنێتە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیو لەڕێگایەکی ژیاریو هاوچەرخەوە. وەك مافێکی رەوا داکۆکیان لەکوردو مافی چارەنووسی کورد کردووە. بەڵام لەهەمانکاتا وەك راستییەکی مێژوویی ئاخۆ ئەندامانی ئەو لیژنەیە کێ بوون کەتوانیبێتیان یاداشتنامەکەیان بۆ بەردەم کارەکانی کۆنگرە بەرزکردبێتەوەو ئەو وڵاتو ئەندامەی کۆنگرەش کێ بووبێ ئاسانکاری تەواوی لەو بارەیەوە بۆ دەستەبەر کردوون. یادەبێ لەداهاتوودا ئەو رووناکبیرەی کورد کێبێ کەحەقیقەتو بنەماکانی دەقی ئەو یادداشتنامەیەمان بۆ ساغ بکاتەوە لەچوارچێوەی بەڵگەنامە گرنگەکانی ئێستای رێکخراوی نێودەوڵەتیدا.

رایەکی تریش بۆ ئەوەی بەڕاشکاوییەوە، ئەوەمان لائاشکرا بکات کەکورد لەکاتی کۆنگرەی ناوبراودا، ویستویەتی داواکاری خۆی بگەیەنێتە ناو دانیشتنەکانی کۆبوونەوەیەکی ئەوتۆی نێودەوڵەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکان. ئەوەشیان نووسەرێکە، پێ دەچێ میسری بێ بەناوی (حبیب جاماتی)ەوە، لەگۆڤاری (المصور)داو لەژێر سەردێڕی (الأكراد يريدون انشاء دولة) بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە، لەبەشێکی ئەو بابەتەدا باسی لەچۆنێتی ئەو داواکارییەی کوردان کردووە بۆ بەردەم نوێنەرانی وڵاتان لەکۆنگرەی (سان فرانسیسکۆ)داو، وتوویەتی: (لە٢٩ی مارسی ١٩٤٥دا نوێنەرانی کوردیش یادداشتنامەیەکیان بۆ

پێش ئەندامانی ولاتان لەسان فرانسیسکۆ ناردووەو، تیایدا داوای دامەزراندنی ولاتێکی سەربەخۆیان کردووە لەو ناوچانەدا کەبەزۆری دانیشتوانەکەی کوردن لەتورکیا، عیراق‌و ئێران، وەك لەیاداشتنامەکەشیاندا هاتووە کەژمارەی کوردان لەهەرسێ ولاتی ناوبراودا خۆی دەدا لە(٩،٥) ملیۆن‌و نیوکەس. جگە لەوەش باسی لەو کۆنگرەیەش کردووە کەکوردەکان لەنۆڤەمبەری ساڵی ١٩٤٥دا لەشاری باکۆ بەستوویانە. (بڕوانە: حبیب جاماتی، المصور، العدد (١٣١١) نوڤمبر ١٩٤٩). بۆ زیاتر روونـاکی خستنەسەر دیاردەیەکی وا پێویستە رووناکبیرانی کورد بەتایبەتی ئەوانەی لەدەرەوەی کوردستانن. یائەوانەی نیشتەجێی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان. بەتەنگ ئەم مەسەلەیەوە بچن‌و، زانیاری‌و شارەزایی زیاترمان لەم بارەیەوە بۆ ئاشکرا بکەن، کەئەمەش بۆ خۆی حەقیقەتێکی شاراوەیەو لێکدانەوەو تەتەڵەکردنی بنەماکانی هەوڵ‌و تەقەللایەکی دیبلۆماسیانەی تازەترو دەوڵەمەندترمان لەبارەی کوردو خەباتی کوردایەتییەوە بۆ ئاشکرا دەکا.

*ئەم باسە لەرۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (١٦٨٠)ی ٢٠/٨/١٩٩٨ بلاوکراوەتەوە.

# باسی سیازدەیەم

## حوزنی موكریانی و هەوڵێكی زیندوو لە بواری مێژوو و كاری ڕۆژنامەنووسیدا

زۆرن ئەوانەی كە لە پێناوی ناساندن و زیندوو كردنەوەی مێژوو، كەلەپوور و باری ڕووناكبیری گەلەكەیاندا هەردەم شەو و ڕۆژیان داوەتەدەمی یەكتر و بە بەردەوامی وبێ دابڕان لە شەونخونی و كۆششێكی ئەو تۆدا بوون گەرپێیان بكرابا خۆیان بەكونی دەرزی دادەكرد بەو مەرجەی بارێكی لاسەنگیان بۆ گەل و وڵات ونەتەوەكەیان سەنگ بكردایەتەوە وخشتێكی تریان بخستایەتە سەردیواری ئەو كۆشك و تەلارەی كە زیاتر بە دونیای ژیاری و شارستانیەتیان ئەناسێنێ، دیارە لە ناو گەلی كوردیشدا ڕووناكبیر و كەسایەتیەكی وەك(حوسێنی كوڕی عەبدوللەتیف)ی موكریانی كە لە١٢ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٣ لە شاری(سابلاغ-مەهاباد)ی ناوچەی موكریان لەدایك بووە و، بە یەكێك لەو سەربازە ماندوونەناسانە دەناسرێ كەبێ ترس و سڵەمینەوە بتوان ێلە هەموو دەرگا ڕووناكبیریەكانی: مێژوو، ئەدەب، ڕۆژنامەنووسی، مۆرهەڵكەنی، كردنەوەی چاپخانەو چەندین بواری دەوڵەمەندی تر بدا و بە بەردەوامی لە هەوڵی ئەوەدابێ كەلە چ تەوەر و لە

چ دەروازەیەکەوە بچێتە ژووری و چ ڕێڕەوێك ئەیگەیەنێتە ئەوچڵەپۆپە و ئاسۆیەی کەپێی ئەوترێ ڕەوشی خزمەت کردن و زیندووکردنەوەی باری ڕووناکبیری کوردی کە لەو سەروبەندەدا سەری خۆی هەڵگرێ و بچێتە وڵاتێکی وەك ئەڵمانی ئەو ڕۆژگارە و دواتر چاپخانەیەك لەگەڵ خۆیدا بهێنێتە شاری(حەڵەب) و یەکەم چاپخانە بەناوی کوردستانەوە لە ساڵی١٩١٥دا دامەزرێنێ پاشان بیهێنێتەوە شاری ڕەواندز و دەیان بەرهەمی ناوازە لە بارەی کورد و باری ڕووناکبیری کوردیەوە پێ لە چاپدا سەرەڕای هەموو ئەوانە خۆشی ئەتوانرێت بوترێ، یەکێکە لە کەسایەتی یە(ئینسکلۆپیدی)یەکانی گەلی کورد لە ساڵانی سەدەی بیستەمی ڕابووردودا. بەتایبەتی لە بواری مێژوو و تۆمارکردنی قوناغەکانی مێژووی گەلی کورددا. تا لە ژیاندابوو نزیکەی حەڤدە کتێبی هەمە جۆری چاپو وبڵاوکردەوە لەوانە یازدەیانی بۆ بواری مێژوو تەرخان کردبوو، بەزۆری ئەوانەش کە چاپو بڵاوی کردونەتەوە لە سەردەمی خۆیدا بە زۆری بریتین لە(غونچەی بەهارستان١٩٢٥، ئاوڕێکی پاشەوە لە ٣بەرگدا ساڵانی١٩٢٩-١٩٣١، کوردستانی موکریان یا ئەوترو پاتین١٩٢٨، لاپەڕەیە لە دیرۆکی کوردستانی موکریانی ١٩٤٧، کوردو نادرشا١٩٣٤، مێژووی ناودارانی کورد١٩٣١، مێژووی شاهنشاهانی کوردی زەند لە خاکی ئێراند١٩٣٤...) وگەلێ کتێبی تر لە بواری ڕۆژنامەنووسیشدا هەر چەندە خۆی لە زۆربەی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردیانەدا کە لە سەردەمی ئەودا بڵاوئەکرانەوە. نووسین و وەرگێڕانی دەوڵەمەندی بڵاودەکردەوە. هاوکات خۆشی بۆ یەکەم جار لە حوزەیرانی ساڵی١٩٣٦ەوە. بە هاوکاری(گیو)ی برای گۆڤاری(زاری کرمانجی)یان بڵاوکردۆتەوە واتە تا ڕۆژی داخستن و وەستانی گۆڤارەکە لە ٣١ی تەموزی ساڵی١٩٣٢دا بەسەریەکەوە توانیویانە(٢٤)ژمارەی لێ

بڵاوبكەنـەوە دواتریش لەبـەر هـەر هۆیـەك بووبـێ بـە نـاوی خـاوەنی ئیمتیـازی(پـارێزەر شـیت مسـتەفا)ەوە گۆڤـارێكی هەفتانـەی بـەناوی(ڕوونـاكی)یـەوە بڵاوكردۆتـەوە كـە هەڵسوڕێنەر و بەڕێوەبـەری ڕاستەقینەی(حوزنـی موكریـانی) و مامۆسـتاگیوی براشـی بـە نووسـین و بابەتی خۆی یاریدەدەر و هاوكاری بەردەوامی كردووە یەكـەمین ژمـارەی لـە ٢٤ی تشرینی یەكەمی١٩٣٥ و دوا ژمارەشی لە ٢٦ی مایسی١٩٣٦دابڵاوكردۆتەوە واتە بە سەریەكەوە تەنها(١١) یـازدە ژمارەیـان لێ دەركـردووە. سـەرەڕای ئـەو هاوكاری كردنە بەردەوامەی كە لە گۆڤاری(دیاری كوردستان)، دەنگی گێتـی تـازە و(ژیـن)ی پـیرەمێرد داهـەیبووە. لـە ڕۆژگارێكیشـدا كەویستوویەتی دووبـارە چاپخانەكـەی لـە شـاری هـەولێردا بخاتـەوە گـەڕ زۆر پێویسـتی بـە پارمـەتی و دەسـتگرۆیی خـەمخۆرانی ئـەم بـوارەی ڕۆژنامەنووسـی و ڕووناكبیری كوردی بووە. بۆ ئەوەش هەر چەنـدە هـەوڵی داوە پێـی نـەكراوە كە پارەیەكی ئـەوتۆوە دەسبخا تابتوانـێ چاپخانەكـەی پـێ چاك بكاتـەوە و بیخاتـەوە گـەڕ بۆیـە پەنادەباتـە بـەر ئـەو كەسانەی كـە لـە شارەكانی تـری كوردستان دەیانناسـێ و بەناچاری پەوە لای خەڵكانی تـر پارەپەیدا دەكا بۆ دووبارە بەڕێوەبردنەوەی چاپخانەكەی هەروەك لە یاداشتی ڕۆژانەی خۆیـدا لەم بارەیەوە نووسـیویە: لەبەرئـەوە كـە لـە هـەولێر خـەریكی دامـەزراندنی مەتبەعەكەبووم هەر چەند كۆشام چارەیەكم نەكرا كە هەندێك پارە دەست بخەم كە بنێرم حرفات بكڕم ناچـار وتم دەچمـە كـەركوك و سلێمانی پـارە پـەیدا ئەكـەم و دەچمـە بـەغدا حروفـات دەكـڕم) بڕوانـە(هاوكـاری) ژمارە(١٣٠٧). جگە لەمانە حوزنی موكریانی لە سەرەتای لاوی و لەوكاتەوەی كـە تـازە هۆگـری كوردایـەتی و ئاشـنای لەگـەڵ دونیـای ڕووناكبـیری و خوێندەواریدا پەیداكردبوو. كەوتە ئەوەی وەك گەڕیدە(رحالە)یەك و وەك

کەسێك کە بیەوێ شارازایییەکی گەورە لە سەرگەلان و نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات پەیدابکا زۆربەی شارەکانی ئەو دەمەی وەك: تەورێز و یەریڤان گەڕاو پاشان گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتانی وەك ئەرمینیا و ئەزەربیجان دوابەدوای ئەوە توانیویەتی:(لە شاری یەریڤان ڤوتابخانەیەکی تایبەت بە زمانی کوردی بکاتەوە و هەر لەو دەمانەدا کەوتۆتە دەرس وتنەوە بە(منداڵەکانی شمس الدینوف و حاجی یوسف بەگ لە کوردەکانی ڕوسیا کەیەکێك بوون لە ڤوتابییەکانی مامۆستای ئەمر حوزنی) بەجۆرێ ئەم گەڕان و هەوڵدانانەی وای کرد کە پەیوەندی و ئاشنایەتیەکی بتەوی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناس و ڕووناکبیر و گەڕیدە ناسراوەکانی ئەو دەمەی جیهانی وەك: باسیل نیکیتین، مینۆرسکی، جەلادەت بەدرخان، عەلی سەیدۆ گەورانی... و چەندین کەسی تردا هەبێ بە شێوەیەکی ئەوتۆ نامە گۆڕینەوە و بیروڕا گۆڕینەوەیەکی بەرچاوی لەگەڵیانداپەیدا کردبوو. بەتایبەت سەبارەت بە شارەزابوونی زیاتر و لێك گەیشتنی زیاتر سەبارەت بەکورد و کوردۆلۆژیای گەلی کوردستان دیارە هەر ئەو نزیکبوونەوە و ئاشنایەتی پەیدا کردنە بووە کەوا لە کەسایەتیەکی وەك پرۆفیسۆر نیکتیین بکا لە بارەی حوزنی موکریانییەوە بڵێ:(سەیدحسێن حوزنی موکریانی مونەلیف و مێژووناسی گەورەی کوردستان.. منەتی وی بەسەر هەموو موستەشرقینی فەرەنگستاندا مەعروف و مەعلوم و مەشهورە) بڕوانە، جمال خەزنەدار، ڕابەری ڕۆژنامەگەری، ل١٤٨. لە برگەیەکی تریشدا ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسێکی گەورەی وەك ڤلادمێر مینۆرسکی کاتێك وەسفی بە ناوبانگ دەکا و بۆی دەنووسێ:(ئێوەحەقیقەتەن گیانی میللەتی خۆتان ئەو ڕەنجانەی کە دەیانکێشن هیچ وەختێك لەبیرناچێتەوە، ئەسڵەن میللەت و وەتەن پەرستانی وەکو ئێوە مایەی تەرەقی میللەتن...) هەموو ڕاوبۆچوونێکی

ئەوتۆش بۆ خۆیان لەو گەواهی و شەهادەتە بەرزانەن کە هەردەم حسین حوزنی موکریانی لە ناوەندی ڕووناکبیری کوردی و مرۆڤایەتیدا خۆشەویست ترو بەرزتر بنرخێنێ وێڕای ئەوەی ئەم کەڵە پیاوە و ئەم زانا گەورەی بواری مێژووناسی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی ڕابووردودا بەتاقە مێژووناسی کورد دەنرێ کە لە نووسینەکانی خۆیدا بە زمانی کوردی و بەشێوەیەکی شارەزایانەو بەسەلیقەی خۆی باسی لە زانستی مێژوو و، قۆناغەکانی مێژوو کردبێ جا ئیتر نازانم کەسایەتیەکی هێندە گەورە و بەوهەموو توانا و خزمەتەی خۆیەوە والە ئینگلیزەکان بکا، وەك مامۆستا گیوی برای لە پێشەکی(مێژووی میرانی سۆران)دا باسی لێوەدەکا و دەڵێ:(ئینگلیزەکان لە ساڵی١٩٤٧دا داماوی برامیان دەرمان خوارد کرد...) بڕوانە، لاپەڕە١، بۆدواجاریش خاوەنی ئەو هەموو بەرهەمە زیندوو بەبایەخانەی بواری مێژوو لە شاری بەغدا لە ١٩٤٧/٩/٢٠ بۆ دواجار چاوی لێك ناو لەسەر وەسیەتی خۆی لە شاری هەولێر ئەسپەردەی خاك کرا.

*ئەم باسە لە ڕۆژنامەی (هەرێمی کوردستان)، ژمارە(١٩٨)ی ٢٠٠٠/٤/٢٠دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی چواردەیەم

## بێدار لە نێوان یانەی سەرکەوتن و چالاکی پارتی هیوادا

بەوەی لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە، ناوچەی خانەقین بنکورە(بن كدورە-مذكرات مأمون بك، ص٣١) یابین کورە، واتە هەزار کورە بە زمانی تورکی، کەوتۆتە دامێنی ناوچەی گەرمیانەوە و نزیکبوە لە سنورەکانی شاری کەرکوکەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ یەکەم جار چالاکییەکانی پارتی هیوا وەك ڕێکخراوێکی سیاسی، لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکاندا لێرەوەدەستی پێ کردووە. هاوکات گەلێك کەسایەتی و ڕووناکبیری ئەم ناوچەیە، پەیوەندیان بەڕێکخستنەکانییەوە کردووە و لە کۆبوونەوە و چالاکی یە سیاسیەکانیدا بەشداربوون. بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم بۆ چوونەشم شێخ عەتای تاڵەبانی لە کاتی خۆیدا و، وەك ئەندامێکی کارای ئەم ڕێکخراوە بۆی گێڕامەوە:(بەزۆری هەموو ئەو کەسایەتی و پیاوە ئاینیانەی لە ناوچەی خانەقین و دەوروبەریدا پەیوەندیان بە هیواوە کردبێ زیاتر لە ڕێگای مەلا سەید حەکیمی خانەقین‌یەوە بووە کاسێتی تۆمارکراو لە ئەرشیفی خۆمدا(اب) بۆ ئەمەش هیچ بەدووریشی نازانم پیاوێکی ئایینی و کەسایەتیەکی وەك بێداری شاعیر(١٨٩٤-١٩٤٩) لە بەرئەوەی

پەیوەندیەکی پتەو و بەردەوامی لەگەڵ مەلا سەید حەکیمدابووە. هیچ گومانی تێدانییە کە بەهۆی ئەویشەوە پەیوەندی کردبێت بە حیزبی هیواوە و هەر لە ڕێگای ئەویشەوە بووە کە(سەرۆکی دەستەی باڵای حیزب) مامۆستا ڕەفیق حیلمی(١٨٩٨-١٩٦٠) ناسیبێ و بەزۆری لە شاری کەرکوك و خانەقین و ناوچەی(بنکورە) سەردانی یەکتریان کردبێت و لە مەبەستی یەکتر ئاگاداربوون تا ئەو کاتەی بووە بە ئەندامێکی ئەو تۆی ناو ڕیزەکانی هیوا، کە لە هەموو ڕاوبۆچوونێکی فیکری و سیاسی خۆی لەگەڵ ڕەفیق حیلمی دا یەکبگرێتەوە ئەمیش بۆ خۆی ناوی شێخ بابا عەلی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەلی شێخ لە تیفی کوڕی سەلیمی هەنجیرانەو لە ساڵی١٨٩٤ لە(ئاوایی گەورە)ی ناوچەی بنکورە لە دایك بووە(بڕوانە، تۆژەر، ژ(١)، ل٢٩). سەرەتاکانی خوێندنی لای شێخ عەبدوڵڵای باوکی دەس پێ کردووە. دواتر لە شاری خانەقین و لای شێخ سالی مودەریس پلەکانی تری خوێندنی بڕیوە و لە ساڵی١٩٤٩ لە نەخۆشخانەی(ئەلمجیدیە)ی بەغدا کۆچی دوایی کردوە وێڕای ئەوەی شاعیرێکی دیار وتەنانەت نموونەی شیعریی خۆی لە ژمارە (٢)ی ساڵی پێنجەمی١٩٤٤ی (گەلاوێژ)دا بلاّ وکردۆتەوە. جگە لەو شیعرانەشی، لە ڕێگای دەستاو دەست کردنەوە لە زۆر بەیاز و کەشکۆڵی ڕووناکبیرانی ئەو دەمانەی کوردستاندا تۆمارکراون. بەڵام وەك بەرهەمی سەربەخۆ، نووسینەکانی کۆنەکراونەتەوە و بەزۆری تیا چوون. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕووی چالاکی سیاسییەوە شوێن و تایبەتمەندیەکی دیاری لە ڕیزەکانی هیوادا هەبووە و گەلێك کەسی نزیك بەخۆی لە ڕێگای(بێدار)ەوە پەیوەندیان بە هیواوە وە کردووە. تەنانەت ئەو نازناوی(بێدار)ەش کە هەیبوە(سەرۆکی دەستەی باڵای پارتی هیوا) مامۆستا ڕەفیق حیلمی بۆی داناوە و ناوی نهێنی ئەوبووە لە پارتی هیوادا. بەجۆرێك

بۆتە نا ویکی وا کە لەلایەن زۆربەی ڕووناکبیرانی کوردەوە بەو شێوەیە جەختی لە سەربکرێتەوە هەر بەو شێوەیەش ناویان بردووە. لەوانە مامۆستا عەلا ئەدین سوجادی(١٩١٧-١٩٨٥) لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەلام بەهەڵە ساڵی(١٨٩٢)ی کردۆتە ساڵی لە دایکبوونی لە کاتێکیشدا کە(یانەی سەرکەوتن-نادی الأرتقا ء)ی کوردان لە شاری بەغدا و لە ئەنجامی هەوڵ و داواکاری چەند ڕووناکبیرێکی کورد لەوانە مارف چیاوك باڵەکی و بەپێی فەرمانی ژمارە(٦٨٩٥)ی ١٩-٣٠ی مایسی١٩٣٠ی وەزارەتی ناوخۆی عێراق هاتەکایەوە دوای چەند ساڵێك لیژنەیەکی کۆمەك کردن بە ناوی(یانەی سەرکەوتن)ەوە کەوتنە زۆربەی شارو ناوچە کوردنشینەکانی کوردستان بە مەبەستی دەسگرۆیی و یارمەتی دانی یانەکە یەکێ لەو شاروناوچانەش سەردانیان کردبێت شاری خانەقین و دواتر ناوچەی(بنکورە) بووە لەم لایەنەشەوە کە سایەتیەکی وەك شێخ بابا عەلی(بێدار) بەپێی ئەو دەرامەتەی هەیبوە لەو دەمانەدا و لە گەلاوێژی ١٩٤٣دا بڕی دوودنیارونیوی ئەوکاتەی بەخشیوە بە(یانەی سەرکەوتن) لە ڕێگای لیژنەی ناوبراوەوە و لە (پەیامی تبرعات)ی یانەشدا کە بە ناوی (باوبوو)ەوە. لە چاپخانەی (نجاح)ی بەغدا و لە ساڵی (١٩٤٣-١٩٤٤)دا بلاو کراوەتەوە. بە:" بابا عەلی مامۆستاو شاعیری باجەلان" ناوی هاتووە. بڕوانە، باربوو، ل٦٥. لەو سەروبەندەشدا کە حزبی هیوا لە سەرەتای چلەکانەوە دووبەرەکایەتی کەوتۆتە ڕیزەکانیەوە. ئەم یەکێك بووە لەوانەی کە شانبەشانی مەلا سەید حەکیمی خانەقین (١٨٩٢-١٩٥٧) بیریان لەچارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە کردۆتەوە. بەتایبەتی ئەو کێشەیەی لە نێوان ئەفسەرەکانی ناو پارتی هیوا و سەرۆکی دەستەی باڵادا هاتبوە کایەوە. بۆ ئەو مەبەستەش لە ساڵی ١٩٤٤دا پێشنیار لەسەر ئەوە کرا (کۆنفرانس)ێك بۆ چارەسەرکردنی

كێشەكانی ناو هیوا ببەسترێ. ئەوە بوو شارەدێی كەلاری ئەو كاتە كە بەگزادەكانی جاف لە گەرمیاندا بەڕێوەیان دەبرد. دەستنیشان كراو كۆمەڵێك كەسایەتیو ئەندامی بەرزی هیوا تیایدا بەشداربوون لەوانە: سەرۆكی دەستەی باڵای حیزب ڕەفیق حیلمی، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، مەلا سەید حەكیمی خانەقین، مستەفا خۆشناو، عزەت عەبدولعەزیز، محەمەد مەحمود قودسی، شێخ عەتای تاڵەبانی و دەیان كەسایەتی تر. (بڕوانە، كەركوك، ژمارە(٥)، ل١٠٢). بەجۆرێ یەكێ لەو ئەندامە بەشدار بووانە شێخ بابەعەلی بێدار بوو. لەكۆتایی (كۆنفرانس)ەكەشدا. دژی بۆچوونی ئەفسەرەكانی ناو هیواو چەپەكان بوو. كە دەیانویست مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەس لەكاری سەرۆكایەتی هەڵگرێ، بەڵكو پاڵپشتی ئەو بۆچوونەی دەكرد. كە دەیانویست مامۆستا حیلمی وەك سەرۆكی دەستەی باڵای حیزب بمێنێتەوەو هیچ جۆرە گۆڕانێك لەڕیزەكانی هیوادا دروست نەبێت. كە ببێتە هۆی تێك چوون و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی.[١٣]

---

[١٣] ئەم باسە لە ڕۆژنامەی (كوردستانی نوێ) ژمارە(٢٥٢٦)ی، ٢٠٠١/٨/٨دا بڵاوكراوەتەوە.

# باسی پازدەیەم

## مێژووی دامەزرانی
## یەکەم قوتابخانە لە شاری کەلار١٩٣١

شارە دێی کەلار بەوپێیەی هەر لە سالآنی سەدەی نۆزدەیەمەوە شوێنێکی ئاوەدان و مەکۆی بەیەکگەیشتنی هەموو ئەو دێهات و گوندانەی ناوچەی گەرمیان بووە. بۆ پێکەوە گرێ دانیان بەیەکترەوە ئەوەش وایکردوە ڕۆژبەڕۆژ هەنگاوی زیاتر و گەورەتر بەرەو پێشەوە بنێ، هاوکات ئاوەدانی و، سەرچاوەکانی ئاوەدانی و نیشتەجێ بوونی بە شێوەیەکی فراوانتر و پێشکەوتووتر تیایدا دەستەبەربێ هەر چەندە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی(١٢٩٩-١٩٢٢) و دواتر دەسەڵاتی پاشایەتی(١٩٢١-١٩٥٨) لە عێراقدا مۆرك وسیمای دەرەبەگایەتی و دەسەڵاتی بنەماڵە و باڵا دەستبوونی ئاغا وەك هەرناوچەیەکی تر لە کوردستان و عێراقدا ڕۆڵ و تایبەتمەندی خۆی بینیوە. بەڵام شان بە شانی ئەوە دەوڵەت بۆ خۆی پاڵپشتییەکی بەرچاوی ئەم دیاردەیەی کردووە و بەبەردەوامی ئەو ڕەوش و بارودۆخەی لە بەرژەوەندی خۆیدا لەبەرچاو گرتووە. وێڕای ئەوەی بنەماڵە و چینە دەسەڵاتدارەکان لە ناوچە جۆربەجۆرەکاندا چ بۆ خزمەت کردنی خۆیان و چ بۆ ئەو ناوچانەش کەلە ژێردەسەڵاتی ئەواندایە

بەڕێوەیان بردووە و هەوڵیانداوە کاری بەردەوام و خزمەتی بەردەوامی خۆیانی تێدا بکەن. هەر چەندە هەندێجار ئەوەش وەك کارێکی سەلبی بە سەریاندا شکاوەتەوە. بۆ نموونە کردنەوەی قوتابخانە یا ناوەندێکی وەك سەرچاوەی زانست و خوێندەواری. چینی دەرەبەگ لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیاندا بەو ئاقارەیاندا دەبرد کە ئەمە لە ئایندە و لە دواڕۆژدا کارلێکێکی خراپی دەبێ لە بەڕێوە بردنی دەسەڵات و ڕەوشی گوێ گرتنی ڕۆژانەی خەڵك و، دانیشتوان بۆ فەرمان و جێبەجێ کردنی هەر بڕیارێك کە لەوانەوە دەردەچوو. لە کاتێکدا ئەبوایە خەڵك بە تەواوی پابەند بوونایە بەو بڕیارو فەرمانانەوە کە لەلایەن سەرۆکی خێڵ و هۆز و گەورەی دێوە دەردەچێ. چونکە بەکردنەوەی ناوەندێکی زانستیوا. منالی چینی هەژار و توێژی ڕەشۆکی خەڵك وشیاریان، بیریان، ئاستی هەستکردن و داواکاریان زیاتردەبوو، هەرئەوکاتەش(پابەندبوونی) کۆمەڵایەتی بۆچینی باڵادەس کەمتردەبووەوە. هەر لە خۆڕاش نەبووە کە لە تەوەر و ناوچەیەکی وەك گەرمیان(کەلار-کەلیاریان کەلاڕێ) و لە سەروبەندەدا کە بنەماڵەی جاف و بەگزادەکانی جاف بەڕێوەیان بردووە و لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ هەنگاوی باش و خزمەتی گەورمیان بەناوچەی ژێردەسەڵاتی خۆیان کردووە. بەڵام لە کاتێکدا شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لە عێراقدا بەرپابوو و کۆتایی بە دەسەڵات و سیستەمی پاشایەتی هات. لێرە بەدواوە دەسەڵاتی بنەماڵە و چینی دەرەبەگ لەم ناوچەیەشدا بە تەواوی بەرە و نەمان چوو. لە کاتێکیشدا قسە لەسەر بابەت و لایەنێکی وادەکەین دەبێ تۆزێك بەنیهاد و بەویژدانەوە ئەوەش لە بەرچاو بگرین و باسی ئەوەش بکەین کە پێشتر کەلار لەلایەن هۆزەکانی(گێژ، ڕۆژبەیانی و پالانی) یەوە ئاوەدانی تێکەوتوە

نیشتەجێ بوون. شارەدێیەکی وەك کەلار(تارادمیەك) بە هەوڵی بنەماڵەی بەگزادەکانی جاف و هۆزی جاف سەرچاوەکانی ئاوەدانی پێ گەیشتوە وەك دەبینی مێژووی کردنەوەی یەکەم قوتابخانە و وەك ناوەندێك بۆ خوێندن لە شاری کەلاردا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سیەکانی سەدەی بیستەمی ڕابووردوو، بەپێی یەکەمین تۆمارنامە(سجل)ی قوتابخانەکە کە تاوەکو ئێستاش وەکو خۆی ماوەتەوە لەبەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکەداو، وێڕای ئەو چاوپێکەوتنانەی کە لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی ئەوکاتەدا ئەنجامم داوە. یەکەمین قوتابخانەی سەرەتایی چوار پۆلی لە ساڵی خوێندنی(١٩٣١-١٩٣٢)دا کراوەتەوە کە ئەمڕۆ پێیدەوترێ قوتابخانەی(شێروانە)ی سەرەتایی.

هەربۆ ئەم مەبەستەو لە ساڵی(١٩٩٦)دا مستەفا بەگی جاف(١٩٢٥-١٩٩٧) لە بارەی دامەزرانی یەکەمین قوتابخانەوە لە کەلار کە بۆ خۆییەکێ بووە لە قوتابیە سەرەتاییەکانی دەیوت:(کردنەوەی یەکەم قوتابخانە لە کەلار بە هەوڵی حەمەبەگی فەتاح بەگی جاف کە ئەوکات ئەندامی پەرلەمانی عێراق) و نوێنەری لیوای کەرکوك(کفری) بووە و بە کۆششێکی زۆری مێژوونووسی گەورە حەمە ئەمین زەکی بەگ(١٨٨٠-١٩٤٨) کە لەو سەردەمەدا وەزیری ئابووری و هاتوچۆ بوو لە وەزارەتی دووەمی نوری سەعید(١٨٨٨-١٩٥٨)دا و لە ساڵی ١٩٣١دا کراوەتەوە.

سەرەتا ئەم قوتابخانەیە هەر بە ناوی کەلار تا ئەوکاتەی شوێنێکی تایبەتی بۆدابین و تەرخانکراوە. حەمە بەگی جاف(١٩٠٤-١٩٣٤) لە ماڵەکەی خۆیدا کە ئەوکاتە لە(کەلاری کۆن)ی ئێستابووە. کاروباری بەڕێوەچووە. یەکەم بەڕێوەبەری مامۆستا(تۆفیق عەلی عەبدولڕەحمان) بووە و، بەپێی ئەو خشتەیە(لوحە)یەی کە تا ئێستا لە(قوتابخانەی کەلار)ی ئەوکات و(شێروانە)ی سەرەتایی ئێستادا هەڵواسراوە لە ڕێکەوتی(١٩٣١/١٠/١)ەوە

دەسبەکار بووە و نزیکەی (٩)نۆ ساڵی تەواو وەك بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە ماوەتەوە و لە(١٩٤٠/٩/١٥)دا ڕاژەی مامۆستایی خۆی گواستۆتەوە و دەستی لە کاری بەڕێوەبەرێتی قوتابخانەکە کێشاوەتەوە. بەڵام من وای بۆ دەچم کە: مێژووی دامەزرانی قوتابخانەکە چەند مانگێك دواتر بووبێ تا ئەوەی لە(١٩٣١/١٠/١)دا کرابێتەوە. لە کاتێکیشدا بۆ ڕاستی و دروستی ئەم بۆ چوونەشم گەڕامەوە بۆ سەر(تأریخ الوزارات العراقیة- مێژووی وەزارەتەکانی عێراقی) مێژووناسی ناسراوی عێراق(عەبدولرەزاق ئەلحسەنی) بەرگی (٣)بەغدا١٩٨٨، بۆم دەرکەوت کە خوالێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگ لە وەزارەتی یەکەمی نوری سەعیددا وەزیرنەبووە. کە لە٢٣ی ئازاری١٩٣٠دا پێکی هێناوە و لە ١٩ی تەشرینی یەکەمی١٩٣١ دا وەزارەتەکەی هەڵوەشاوەتەوە. بۆ دواتریش دووەمین وزارەتی خۆی هەر لە ١٩ی تەشرینی یەکەمی١٩٣١داپێك هێناوەتەوە و تا ٢٧ی تەشرینی یەکەمی١٩٣٢ی خایاندووە. بەڵام لەم وەزارەتەیاندا و، وەك لە لیستی ناوی وەزیرەکاندا دیارە ئەمین زەکی بەگ(١٨٨٠-١٩٤٨)وەزیری ئابووری و هاتوچۆبووە و، حەمە بەگی فەتاح بەگی جافیش هەر بە پێی(مێژووی وەزارەتە عێراقی)یەکانی ئەلحەسەنی و هەمان بەرگی(٣) و لەلاپەڕە٦٦یدا، نوێنەری کەرکوك بووە لە پەرلەمانی عێراقی ئەوکاتەدا. ئەم ڕێکەوتەش بۆخۆی جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ڕۆژی کردنەوە و دەسبەکار بوونی یەکەم بە ڕێوەبەری قوتابخانەکەدا کە لە(١٩٣١/١٠/١)دابووە. هاوکات ئەمە ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنێ ئەم قوتابخانەیە ڕەنگ بووبێ لە ناوەڕاستی مانگی(١١)ی هەمان ساڵدا کرابێتەوە و مەسەلەی ڕۆژی دەسبەکاربوونی بەڕێوەبەرەکەش هەر لەبەر ئەوەبووە. لە وڵاتی خۆمان و زۆربەی وڵاتانی تری ڕۆژهەڵاتدا سەرەتاکانی ساڵی خوێندن هەر لە١/١٠ی هەموو ساڵێکەوە دەس پێ دەکا وەکو ئاشکراشە بەپێی یەکەمین

تۆمارنامە(سجل)ی قوتابخانەکەو لە ساڵی یەکەمی خوێندنیدا تەنها(٢٨) قوتابی ڕوویان کردۆتە خوێندن و ساڵی لە دایك بوونیشیان لە نێوان ساڵانی(١٩١٨-١٩٢٥)ی زایینی بووە. هی واشیان هەیە ساڵی لە دایك بوونیان بەرامبەر ناوەکانیان تۆمارنامەکەدا بەرچاوناکەوێ. جگە لەوەی زۆربەی زۆریان کوڕ بوون و تەنها یەك کچیان لە گەڵدابووە کە ئەوەش بۆخۆی(ئەختەرخانی کچی حەمە بەگی جاف) خوێ بووە کە دەکاتە خوشکی کە سایەتی ناسراو بە (حەمە سەعید بەگی جاف)و پوری هەردوو شاعیرو نووسەری ناسراو (خەسرەوجاف) و(نەبەرد جاف). بەلاّم لە ساڵی دووەمی خوێندندا واتە(١٩٣٢-١٩٣٣) ژمارەی قوتابیانی کچ لە قوتابخانەکەدا زیادی کردووەو بوە بە(٣)کچ کە ئەوانیش بریتی بوون لە:-

١-وەفیقە تۆفیق عەلی کچی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە خۆی بووە.

٢-قەدری وەستا حەمیدی ناڵبەند.

٣-ڕەعنای کچی حەیدەر سادە واتە خوشکی خوالێخۆشبوو حەسەنی حەیدەر(هەیەر) و حسین حەیدەر واتە حسەینە کەڵەی گۆرانی بێژ.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو قوتابی و خوێندکارانەی کە لە ساڵی یەکەمی خوێندنی وەرگیرابوون بەزۆری خەڵکی کەلاری ئەوکاتە بوون تەنها دوانیان نەبێ کە یەکێکیان(عەبدولباقی ئەکبەر خان) و ئەوی کەشیان(عەبدوڵلا مەحمەد جوانڕۆیی) بووە. بە جۆرێ یەکەمیان: لە گوندی(دەککە)ی ناوچەی بنکورەی ئەوبەری سیروان و لە نزیك شاری(خانەقین)ەوە هاتووە.

ئەم قوتابخانەیەش وەك هەرەمێکی کارگێڕی لەودەمانەدا سەر بە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی لیوای کەرکوك بووە. لەبەر بایەخی مێژووی و بۆ سوودی گشتی لێرەدا وای بەباش دەزانم ناوی قوتابی و خوێندکارە

یەكەمەكانی ساڵی دامەزرانی قوتابخانەكەو ناو ئەو بەڕێوەبەرانەش كە تا كاتی بەرپابوونی شۆڕشی١٤ی گەلاوێژی١٩٥٨ لەم قوتابخانەیەدا دەستبەكاربوون تۆماربكەم كە ئەمانەبوون:-

١-ئەحمەد مەحمەد فەتاح.

٢-خالید ڕەزا بەگ.

٣-عەبدوڵلا مەحمەد فەتاح.

٤-حەسەن حەیدەر سادە.

٥-عەلی ڕەحیم تازە ئەوڕەحمان.

٦-عەبدول باقی ئەكبەرخان.

٧-حەمە سەعید بەگی مەحمەد بەگی جاف.

٨-حسێن حاجی محێ دین.

٩-ئیبراهیم شێخ حەسەن ئەحمەد.

١٠-مەحمەد عەلی شێخ حەسەن ئەحمەد.

١١-عەلی شامە.

١٢-مەحمود وەستا ڕەشید.

١٣-حەمە ئەمین ئەریمان دەروێش.

١٤-نووری عەبدوڵلا جۆلا.

١٥-قادر مەحمەد صالح.

١٦-مەحمەد ئەمین عەبدوڵلا سوور.

١٧-كەریم مەحمود قادر.

١٨-موسا پیرومیس.

١٩-قادر عەبدول مەحمەد.

٢٠-ئەحمەد عارف.

٢١-مەحمەد ڕەشید مەحمەد عەزیز.

٢٢-حسێن سۆفی فەتاح.

٢٣-کاکە عەبدوڵڵای سەمین.

٢٤-مەحمود ڕەزا بەگ.

٢٥-عەبدوڵڵا مەلا مەحمود جوایزۆیی.

٢٦-مەحمەد فەقێ مەحمود.

٢٧-مەحمود مەحمەد حاجی ئەلماس.

٢٨-ئەختەر مەحمەد بەگی جاف.

بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکەش لە کاتی دامەزرانییەوە تا کاتی بەرپابوونی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ئەم کەسایەتیانەبوون:

| ناوی بەڕێوەبەر | مێژووی دەسبەکاربوون | مێژووی دەس لە کارکێشانەوە |
|---|---|---|
| ١-تۆفیق عەلی عەبدولڕەحمان | ١٩٣١/١٠/١ | ١٩٤٠/٩/١٥ |
| ٢-حەسەن عەباس ڕەزا | ١٩٤٠/٩/١٥ | ١٩٤١/١٠/١ |
| ٣-سەلیم بەگ دەفتەری | ١٩٤١/١٠/١ | ١٩٤٥/١٠/١ |
| ٤-ڕەشید مەحمەد عەلی | ١٩٤٥/١٠/١ | ١٩٥٠/١٠/١ |
| ٥-مەحمەد مستەفا مولکی | ١٩٥٠/١٠/١ | ١٩٥١/٩/١٥ |
| ٦-بەهجەت بەدری بەیاتی | ١٩٥١/٩/١٥ | ١٩٥٦/٩/٢٤ |
| ٧-حسین مەحمود عەلی بەیاتی | ١٩٥٦/٩/٢٤ | ١٩٥٨/٩/١٥ |

[١٣]

---

[١٣] ئەم باسە لە(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٩٥٧)ی١٦/١٠/١٩٩٩دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی شازدەیەم

## كورد لەساڵڕۆژی شۆڕی(٣٠) حوزەیرانی ١٩٢٠دا

هەر لە سەرەتاكانی جەنگی یەكەمەوە بەریتانیای گەورە دەستی بەسەر بەشێكی گەورەی وڵاتی عێراقدا گرت. بەڵام ڕووبەڕووی گەلێك كۆسپ و بەرگری بەردەوامی گەلانی عێرا ق بە عەرەب و كوردەوە بوەوە. سەرەڕای پاشماوەی ئەو سوپایەی كەدەوڵەتی عوسمانی هەیبوو لە عێراق و ناوچەكەدا. لەلایەكی كەشەوە بەهۆی هێرشی بەردەوام و پاڵپشتی كردنی سوپای بەریتانیاوە لە ناوچە جیاجیاكانی تری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ هێزەكانی خۆی. لەسەرەتادا بەتەواوی توانی دەس بە سەر هەردوو ویلایەتی(بەسرەوبەغدا)دا بگرێ و هاوكات ئاگر بڕی(مۆدرۆس)یشی لە ساڵی١٩١٨ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دا مۆربكا. واتە ئەوكاتەی كە سەرەتای سوپای بەریتانی گەیشتبوە سنورەكانی ویلایەتی موسڵ. بە تایبەتی دەوروبەری شاری كەركوك خۆهەر كە جەنگیش لەبەرژەوەی وڵاتانی هاوپەیمان كۆتایی هات. بەتەواوی ئەوە بۆ بەریتانیا یەكلایی بوەوە. دەس بەسەرویلایەتی موسڵدا بگرێ بەتایبەتی پاش ئەوەی لە كۆنگری ئاشتی١٩١٩ی پاریسدا بڕیار لە سیاسەتی(ئینتداب)درا. ئەمەش بۆ خۆی لە

بەرژەوەندییەکی گەورەی حکومەتی بەریتانیادا بووە. سەبارەت بەداگیرکردنی عێراق بەکوردستانی باشووریشەوە هەرچەندە پێشتر لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد بەرابەرایەتی شێخ مەحمود لە ئەوپەڕی گەشەکردن و تەشەنە کردندابوو بەمەبەستی پێکهێنانو دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ناوچەکەدا ئەمەش وای لە شێخ مەحمود کرد لەو ماوەیەدا کە پەیوەندی بەبنکەی سەربازی بەریتانی‌یەوە بکا لە ئەسکی(کفری) تا حوکمداریەتێکی کوردی لە شاری سلێمانیو دەوروبەریدا لە ١٩١٨/١١/١ەوە دامەزرێ واتە پێش کۆتایی هێنانی جەنگی یەکەمی جیهانی بە(١٠)دە ڕۆژ شان بەشانی ئەوەش ڕاوێژکارێکی بەریتانی لەگەڵدابێ. وەك ئەوەی پاش ڕازیبوونی حاکمی گشتی بەریتانیا لە بەغدا(ویلسن)، مێجەرنۆئیل بۆ ئەو مەبەستە لەلایەن بەریتانیاوە دیاری کراو حکومەتی یەکەمی شێخ مەحمود پێکهێنرا بەڵام بەهۆی ئەوەی کە جۆرە ناکۆکیەك لە نێوان کورد و هێزەکانی بەریتانیادا دروست بوو لەسەر بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچە کوردنیشنەکان بۆیە بەریتانیا کەوتە ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاروباری ئەم ناوچەیەبگرێتە دەس و کۆتایی بەحکومەتەکەی شێخ مەحمود لە ١٨ی حوزەیرانی١٩١٩ بهێنێ و بە خۆشی بە بەندکراوی دوای شەڕی(دەربەندی بازیان) و بە زامدارییەوە دراوەتە دادگایەکی سەربازی بەریتانی لە شاری بەغدا و پاشان دوورخستنەوەی بۆ دوورگەی(ئەندامان)ی وڵاتی هیند جا بۆ یە دەتوانین ئەم نەگونجان و یەکنەگرتنەی شێخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بە خاڵی وەرچەرخان دابنێین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەرجەم گەلانی عێراق بەرامبەر بەسیاسەتی بەریتانیا و هەوڵدان بۆ سەربەخۆبوون سەرەڕای ئەوەی گەلێك هۆکاری تری دەرەکی و ناوخۆ ڕۆڵی کاریگەریان لەو

پێکدادانە جەماوەرییەدا بوو کە بۆ یەکەمجار لە ٣٠ی حوزەیرانی١٩٢٠ەوە لە سەرانسەری عێراقدا دژ بە سیاسەتی(ئینتداب) و مانەوەی بەریتانیا بەو شێوەیە لە عێراق و کوردستاندا درێژەی هەبێ هەربۆیە دەکرێ هۆکارە دەرەکییەکانی لە بەرپابوونی ئەو شۆرش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەدا چڕکەینەوە کە پێشتر لە وڵاتانی دەوروبەری وەك شۆرشی حیجازی١٩١٦، پۆلۆی میسری١٩١٩، سەرەڕای بەرپابوونی گەورەترین شۆرشی چینایەتی لە وڵاتی ڕووسیا ساڵی١٩١٧، جگەلەو هۆکارە ناوخۆییانەی کە بەریتانیا بەردەوام لە عێراقدا و بەسەردانیشتوانیدا سەپاندبوو دەشبوایە گەلانی عێراق هەموو باجێکی بەردەوامیان بدایە. ئەمەش بۆخۆی ئەرکێکی گەورەی خستبووە ئەستۆی خەڵکەوە و ماوەیەکی در[illegible]خایەنیش دەوڵەتی عوسمانی هەمان سیاسەتیان پراکتیزەکردبوو. هەموو ئەم دیاردانەش وایان لە گەلانی عێراق بە عەرەب و کوردەوە کرد. دژبە سیاسەتێکی ئەوتۆ بوەستن و بۆ ماوەی زیاد لە پێنج مانگێك زۆربەی ناوچەکانی وڵات لە دەسەڵاتیان ئازادبکرێ هاوکات ئەنجومەن و دەسەڵاتی سەربەخۆیان تیادا بمەزرێ بەڕادەیەك شێوازی ڕاپەڕین و گرتنەوەی شاروشارۆچکەکانی کوردستان لەلایەن کوردخۆیەوە هەر لە نێوەندی هۆزی گۆیانی ناوچەی زاخۆوە گرتیەوە تا بگاتە ئەو پەڕی باشوری لە کفری و خانەقین و دەوروبەریدا لە کاتێکیشدا دەتوانرێ تەنها شارێکی وەك سلێمانی بەوە بژمێردرێ کە بەڕادەیەکی کەمتر بریشکی ئەو شۆرشەی بەرکەوتبێ ئەوەشیان وەکو وتم: بەزۆری لەبەر ئەوەبووە. لەو دەمانەدا کە سایەتیەکی وەك شێخ مەحمود کە بەڕابەرێکی دیاری شۆرش دادەنرا لەلایەن بەریتانیاوە دەسبەسەرکرا کرابوو و لەوڵات دورخرابووەوە. جگە لەمانەش دەتوانرێ وایاس لە کورد بکرێ لە ڕۆژگارێکی وادا وەك گەلێك خۆی ڕاپەڕینی سەربەخۆو شۆرشی خۆی بەرپا کردبێ و هەوڵی

سەربەخۆیی‌دابێ. ئـەگینا خـۆ ئەگەر مەسـەلە هەربەشـداربوون بووبـێ. ئـەوا کەسایەتیەکی وەك(حسین عبدالکریم) بۆ یەکەم جار و لە ڕۆژگاری شۆڕشـدا توانیویەتی ئاڵای عێراق لەسەر فەرمانگەی پۆسـتەی(باقوبـە) کـە ناوچەیـەکی عەرەب نشینە بەرزبکاتـەوە تەنانـەت زۆر لـەڕووناکبیرانی عـەرەبی عـێرا قبـە خۆیان گەواهی لەسەر ئەو لایەنە دەدەن وەك ئـەوەی کـە لـە ئـەیلولی ١٩٢٠ داو بـۆ یەکـەم جـار ناوچەکـە بەشـاری(باقوبـە) شـەوە ڕزگـارکرا لـە دەسـەڵاتی بەریتانیا دکتۆر حسین زبیدی نووسیویە(رفع العلم العراقی فوق دائـرة البريد و هو رجل كردی متحمس لاستقلال العـراق ويحـب وطنـه وبـلاده وقـد خطـب بحماسه في جموع الناس بعربيتـه البسيطه محرضا اياهم علـى القتـال و الثـورة في وجه الآنلكيز المحتلين و بـارك الحـاضرين بثورتـهم وأخـذ كـل منـهم يمـارس عملـه خلافـا الماسودته بعض الآقـلام المأجورة و هكـذا صـار الحكـم في بعقوبــه ثوريا).

بەجۆرێ دەکرێ زیانەکانی بەریتانیا لە کوردستانـدا بـە ڕێژیـەکی گـەورەی ئێجگار گەورەی دارایی مـەزەندە بکرێ سـەرەڕای کوژرانـی سـەدان فـەرمانـدەی سەربازی گەورە لە ناوچەکە داو هاوکات ڕۆڵـی شۆڕشـەکە لـە وشـیارکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردی لەودەمەدا بەهەموو چین و توێژەکانیـەوە بـێ جیـاوازی بـۆ شۆڕشــکردن و پاڵپشــتی بــەردەوامیان بــۆ ئــەو ڕاپەڕینانــەی لــە ناوچــە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا لەوە بەدوا دووبارەدەبوونەوە.[١٤]

---

[١٤] ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٩٠٧)ی ٢٠/٧/١٩٩٩، ڕۆژی سێ شەممە بڵاوکراوەتەوە.

# باسی حەڤدەیەم

## مامۆستا گیوی موكریانی
## لە یادەوەرییەكی سەبری بۆتانی كۆچ كردوودا

زۆرن ئەوانەی لە پێناوی خزمەتی كردن بەگەل و، بەرەوپێش چوونی ڕەوتی ڕووناكبیری و گەشەكردنی باری ڕۆژنامەنووسیدا لە ناوەندی كۆمەڵگەكانیاندا هەردەم هەنگاوی بەردەوام و شەونخونی بەردەوامیان بۆ ئەوەبووە كە نەهێڵن گەل و نەتەوەكەیان لە كاروانی ڕووناكبیریی مرۆڤایەتی دوابكەوێ و هاوشان بەوان ئەمیش گەشە بە بوارە جیاجیاكانی خۆی بدات. دیارە ڕەنگدانەوەیەكی لەو بابەتەو، بە تەنگەوە چوونێكی لەم تەرحە بە تەواوی لە ناو كۆمەڵگای كورد و نەتەوەی كوردا هەمان ڕێرەو وهەمان تایبەتمەندی بەخۆیەوەدیوە بە جۆرێ كە دەیان كەڵەپیاو و زانا و شاعیر و بیریاری تیا هەڵ كەوتبێ و، هەریەكەیان لەدەروازە و لەبوارێكی فراوانەوە چوونەتە ناو دونیای سەرقاڵی خزمەت كردنەوە. یەكێك لەو كەسایەتیانەش كە دەمانەوێ لە یاددەوەریەكی وادا لە ناوەندی ڕووناكبیری كۆمەڵگەكەماندا باسی لێوەبكەین و ڕۆشناییەك بخەینە سەر هەڵوێست و ئەو خزمەتە مەزنانەی كە لە ماوەی خزمەت كردن و سەربردەی

ڕووناکبیری خۆیدا بەجێی هێنابن. ئەوەش بۆ خۆی بنەماڵەی سەربەرزی موکریانی و کەسایەتیەکی ناسراوی وەك مامۆستا گیوی موکریانی(١٩٠٣-١٩٧٧/٧/٢٤) یاوەکتر بڵێین: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوللەتیفی خەزاییە. کەبەبەردەوامی لەگەڵ حسین حوزنی موکریانی(داماو)ی برایدا. ئەوپەڕی ڕۆڵی گەورە و دەوڵەمەندیان لە پێش خستنی مێژوو، زمان و ڕۆژنامەنووسی گەلی کوردا دیوە و، بەجۆرێ ئەبێ وا باسی لێوە بکەین کە هەردەم کوردەواری خۆی بەقەرزاری ئەوماندبوون و شەونخوونیەی ئەو دووبرایە بزانێ و یادو یادەوەری پڕشکۆیان بەرز و بڵند بنرخێنێ گیوی نەمر لەو ڕۆژەوەی حوزنی براگەورەی یەکەم چاپخانەی لەوڵاتی ئەڵمانیاوە هێنایە شاری حەلەبی وڵاتی شام و لە ساڵی١٩١٥دا بۆ کاری چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەدایمەزراند ئەو هاوکاری بەردەوامی بوو لە هەڵسوڕانی کارەکانی دا. دوای ئەوەش کە چاپخانەی ناوبراوی لە(حەڵەب)ەوە گواستەوە ڕەواندزو، دووبارە لەوێوە کەوتنە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی گۆڤارە حوزنی(داماو)ی برایو بەرێوەبەری نووسین مامۆستا گیوبوو تارۆژی داخستن و دوا ژمارەی کە لە١٩٣٢/٧/٣١ بەسەریەکەوە(٢٤) ژمارەیان لێ بڵاوکردۆتەوە کەچی دوای سێ ساڵ لەوەستانی گۆڤاری پێشوو دەستیان داوەتە بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی هەفتانە بە ناوی(ڕووناکی)یەوە. یەکەمین ژمارەیان لە ساڵی١٩٣٥دا بڵاوکردۆتەوە و بەسەریەکەوە تەنها(یازدە) ژمارەیان لێ دەرکردووە، دوای ئەوەش وەکو خۆی باسی لێوە دەکا: کاتێ ئینگلیزەکان حوزنی برایان لە ساڵی١٩٤٧لە ڕەواندز دەرمانخوارد کرد ئیتر بە تەواوی کاروباری چاپخانەی کوردستان و هەموو ئەو چاپەمەنی و کتێب و نووسراوانەی کە لێرەوە بڵاوکراونەوە بەر پرسیارێتی یەکەمیان کەوتە دەس مامۆستا گیو. خۆی هەڵسوڕێنەری سەرەکی هەموو کاروبارێکیان بوو.

هەرچەندە بە خۆشی وەك دکتۆرە کوردستانی کچی دەیگێڕێتەوە لە ساڵی١٩٣٤ەوە:(ڕەواندز بەجێ دێڵێ و ڕوونەکاتە هەولێر) و چاپخانەیەکی گەورە لە شاری موسڵ دەکڕێ. هەر لێرە شبە دواوە سەرەڕای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی گۆڤار و بڵاوکراوە بەزمانی کوردی دەکەوێتە کۆکردنەوە و لە چاپدانی دیوانی زۆربەی شاعیرانی ناسراوی کورد و ساغ کردنەوەیان. لە مایسی ساڵی١٩٥٤ەوە ئیمتیازی گۆڤارێکی وێژەیی هەفتانە بە ناوی(هەتاو)ەوە وەردەگرێ، زۆربەی کارەکانیشی خۆی بەڕێوەی بردوون، بەهاوکاری لەگەڵ(ئیبراهیم دزەیی) و (مەحمەد دەباغ)دا. بەجۆرێ تاکاتی وەستانی گۆڤارەکە لە ساڵی١٩٦٠دا توانیویانە(١٨٨)ژمارەی لێبڵاوبکەنەوە لەگەڵ ئەم هەموو خزمەتە گەورەیەیدا و لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی بەرچاوی هەبووە لە زمانەکانی:(فەرەنسی، ئینگلیزی، فارسی وعەرەبی)دا هەولی داوە گەلێ فەرهەنگی ناوازەی بەوزمانانەو وێڕای(زمانی کوردی) بڵاوکردۆتەوە لەوانە وەك(فەرهەنگی ڕابەر)،(فەرهەنگی مەهاباد)،(فەرهەنگی کۆلکەزێڕینە) و گەلێ کتێبە نووسراوی تری هەمە جۆر. کە هەر یەکەو بۆ خۆیان سەروەری و گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی ئەو پیاوە مەزنەن لەبواری گەشەپێدانی زمان و کلتور و ڕووناکبیری ڕەسەنی کوردیدا واتە تا ڕۆژی کۆچ کردنی لە١٩٧٧/٧/٢٤، دەیان شاکار و نووسراو وبابەتی دانسقەی پێشکەش بە نامەخانەی کوردی کردوە وەك کە سایەتیەکی پاك وڕووناکبیرێکی بە سەلیقە چەندین هەڵوێستی کوردانەی نواندووە بۆ داکۆکی کردن لە ناوی گەل و وڵاتەکەی یەکێك لەو هەڵوێستانەی وەك شاعیری ناسراو سەبری بۆتانی(١٩٢٥-١٩٩٨) خاوەنی دیوانی(شین وشادی) و (دڵستان) کە ساڵی(١٩٩٨) لە ئەوروپا کۆچی دوایی کرد لە کۆتایی هەشتاکاندا لە بەغدا ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە:

دەزگاکانی(حکومەتی عێراق) لە هەولێر چەند جارێك لە ناوەڕاستی حەفتاکان و پێش کۆچکردنی مامۆستا گیوی موکریانی، داوایان لێ کردبوو کە ناوی چاپخانەکەیان لە شاری هەولێر لە چاپخانەی(کوردستان)ەوە بکەنە(چاپخانەی هەولێر) لەبری(کوردستان) ئەویش لەبەر ئەوەی چەند جارێك چووبوونە سەری و لەو بارەیەوە فشاریان خستبوە سەر، بۆ ئەویش ناوی چاپخانەکەی گۆڕی بوو. لەسەر(لوحە)ی چاپخانەکە نووسیبووی(مطبعة اربیل)و، بەخەتێکی پانتر لە ژێرئەو واژەیەوە نووسیبووی(سابقا کردستان). هەربۆ یە دوای ئەوەو، دووبارە هەمان دەزگا ئاگاداریان کردبۆوەوە کە هەر وەك جاری پێشووی لێ بکاتەوە و شتی لەو بابەتە هەڵنەواسێ.[١٥]

---

[١٥] لە ڕۆژنامەی(کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٩١٠)ی، ڕۆژی یەك شەممەی، ١٩٩٩/٧/٢٥دا بڵاوکراوەتەوە.

# باسی هەژدەیەم

## تۆرانیەت و كۆمەڵەی تەعالی كوردستان

ئەو گۆڕانكاریانەی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم بەدواوە لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی(١٢٩٩-١٩٢٢)دا سەریان هەڵدا بە زۆری گەلاڵەبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ چاكسازخوازانی ناودەوڵەت و، ئەوانەشی كە لە دەرەوەی بوون. زۆرجار دژایەتی سیاسەتی دەوڵەت و داوای گۆڕانكاری بەردەوامیان دەكرد لە سیاسەت و حوكمڕانیەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بە جۆرێ كە لەگەڵ گۆڕنكاریەكانی سەردەم و چاكسازیوسیاسەتی ئەوروپای ئەو سەروبەندەدا بگونجێ كە بە تەواوی هەنگاوی گۆڕانكاری بەخۆوە دیبوو هەر ئەمەش وای كرد ئەم چاكسازخوازانەو زۆر لەودەنگ و هەڵوێستانەی كە لە ناوەندی سوپا، قوتابخانە، ناوەندە زانستی و ڕێكخراوە شۆڕشگێڕیەكانی ئەو كاتەوە لێكدی نزیك دەبوونەوە و لەدوایدا بە تەواوی ئەوەی گەلاڵەكرد كە ڕێكخراوی(الأتحاد والترقی-یەكێتی و سەركەوتن) سەرەتا وەك ڕێكخراوێكی نهێنی سیاسی لە ساڵی(١٨٩٩)ەوە بێتەكایەی داواكاریو ئەو گۆڕانكاریانەی كە ئەبوو لە سیاسەتی دەوڵەتدا وەك(دیفاكتە)یەك ڕووبدەن، هەر چەندە بنەمای دروست بوونی پارتی(یەكێتی و سەركەوتن) بەپێی هەندێ

سەرچاوە بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ سەربیرۆکەی چوارکەس لە ساڵی١٨٨٩دا کە دوانیان لە کەسایەتیە ناودار و کوردەکانی ئەوکاتـەی وەك: ئیسحاق سکوتی و عبدوڵلاجەودەت بوون. تەنانەت لە یـەکێ لە کۆنگرەکانیدا کە لـە ساڵی ١٩٠٢ لـە پاریسـی پایتـەختی فەرەنسـا بەسـترا دووکەسـایەتی کـوردی وەك عەبدولرزاق بەدرخان و حیکمەت بابان تیایدا بەشداربوون هاوکات کەوتنە ئـەوەی بە شێوازێکی نهێنی ڕێکخـراوو لقـی خۆیـان لـە زۆربـەی شـار و ویلایەتـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانیدا بکەنـەوە و چـالاکی سیاسـی خۆیـان دەسپێبکەن هـەر لـە سـاڵی(١٩٠٨)ەوە کـە بـۆ یەکـەم جـار هەڵگەڕانـەوەی عوسمانی بەرپابوو شانبەشانی ئـەوە گۆڕانکاریـەکی بناغـەیی لـە دەسـەڵاتی دەوڵەتی عوسمـانیدا ڕوویـدا ڕێکخـراوی(یـەکێتیو سـەرکەوتن) بـۆ زیـاتر سـەرنج ڕاکێشـانی دانیشـتوانو بـۆ پـەیوەندی پێوەکـردن بـە ڕێکخستنەکانییەوە. سەرەتا دروشمی (سەربەستی، عەداڵەتی ویەکسانی) یان بـەرزکردەوە کـەچی بەرزکردنـەوەی دروشمێکـی لـەو بابەتـە تەمـەنێکی ئـەوتۆی نـەبوو کـە بتوانـێ هـەموو ئـەو نەتـەوە و زمـان و ڕەگەزانـەی نـاو دەوڵەتی عوسمـانی بـەو(یەکسانی)یـەی کـە قـاوی بـۆ ئـەدا کۆبکاتـەوە و، بـەجۆرێکی وا کـە هیـچ جیـاوازی ولێـك نەگەیشتنێ دروسـت نـەکا. بـەڵکو سـەرانی(یـەکێتیو سـەرکەوتن) کەوتنـە سیاسـەتی بـە تـورك کـردن و بەرزکردنـەوەی دروشمـی تۆرانیـەت. لەگـەڵ ئەوەشـدا خۆیـان بـەمیراتگری دەوڵەتی عوسمانی دەزانی و هەموو ڕەگەزەکانی تری ناو ئەو دەوڵەتەیان بە تورك وبەوەلە قەڵەمدەدا کە بێنەکایەو ژێر ئاڵای بەرزی تۆرانیەتەوە. وەك ئەوەی لەدوایدا ئەودروشمە بە شێوەیەکی زەقتر جەختی لەسەرئەکرایەوە بـە تایبـەتی بەرزکردنـەوەی بنەمایـەکی وەك(مەرکەزیـەت، تۆرانیـەت و بـەتورك کـردن) بـۆ ئەمـەش وەك خۆیـان(ناویـان لێنـاوە) و ڕێگایـان بـۆ

ڕووناکبیر و خەڵکانی پسپۆڕ بەولایەنەی وەك(یوسف ئاق جۆرمئۆغلی) خۆشکرد کەیەکێ لە تۆرانیەکان و، بۆچوونەکانی لەوەدا ڕەنگیئەدایەوە کە ئەیوت:(ان الذين يرتبطون مع الآتراك بالدين فقط، وليس بالعرق، الا انهم قد امتزجوا مع الآتراك الى درجة معينة، يسهل صهرهم في المجتمع التركى اما الذين لم يتولد لديهم شعور قومي فيمكن تتريكهم) ايران وتركيا، الموصل١٩٩٢،ص٢٢٥. تەنانەت ئەم بیروڕایانە بەزۆری گەیشتبومڕادەی(تۆقاندن) دژ بەنەتەوەو ڕەگەزەکانی تر وەك لە دوایدا بە جۆرێ کاری کردبووە سەر ڕووناکبیرانی ئازادیخواز و کە سایەتیەکانی ناو نەتەوە و ڕەگەزەکانی ترکە بەبێ چەندو چوون دژ بە سیاسەتێکی ڕەگەز پەرستانەی لەو جۆرە بوەستنو هەوڵی ئەوەشبدەن. ڕێکخراو و کۆمەڵە و یانەی ئەوتۆ دابمەزرێنن لە مینبەرێکی ڕەواو چالاکەوە دژایەتی ئەو سیاسەتە بکەن و لایەنگیرەکانی خۆیان لەدەوری ڕێکخستنەکانیدا کۆبکەنەوە بۆ داکۆکی کردن لە مافەکانیان و وشیارکردنەوەی دانیشتوان لە هەر هەوڵێکی تورکان کە کار لە کیان و بیروڕای نەتەوەیەتی، ئایینی ونەریتی کۆمەڵایەتیان بکا نەتەوەی کوردیش وەك یەکێك لەو نەتەوانەی کەماوەیەکی دورودرێژبوو لەلایەن دەسەڵاتی عوسمانیاندا و دواتر تۆرانیەکانەوە مافەکانیان پێشێل کرابوو، هەرئەوەش وایکردبوو. نەتەوەی کوردیش بکەوێتە خەبات و تێکۆشانێکی بەردەوامی ئەوتۆوە کە سوود لە دەرئەنجام و گۆڕانکاریەکانی سەردەمی هەڵگەڕانەوەی عوسمانی وەرگرێ و هەوڵی پێك هێنانی ڕێکخراو و کۆمەڵە و ڕێکخستنی خۆیدا وەك ئەوەی لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە نا هاوسەنگەی لەوماوەیە بەدواوە تۆرانیەکان پراکتیزەیان دەکرد، یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کورد لە ٢٥ی ئەیلولی١٩٠٨ بە

سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی (گەیلانی) شەهید لە ئەستەمبوولّ دامەزرا بە ناوی(کۆمەڵەی تەعالی کوردستان)ەوە واتە(کوردستان تعالی جمعیتی) کە ئەمەش بۆ خۆی لەلایەن کۆمەڵێك لە بیریار(مفکر) و کەسایەتی و ڕووناکبیرانی گەورەی کوردی وەك(ئەمین عالی بەدرخان، فەریق شەریف پاشا، شەهید عەبدولقادری شەمزینی و داماد ئەحمەد ذوکەفەل پاشا)ەوە هاتە کایەوە، جگە لە ڕووناکبیر و کەسایەتیە ناسراوەکانی وەك: خەلیل ڕامی بەدرخان، کامەران بەدرخان، فوئاد پاشا، حیکمەت بابان، حسین وشوکری و فوئاد مەحمود و عەلی لە بابانیەکان، سەید عەبدوڵڵا ورەمزی بەگی خەرپوتی، ئەکرەم جەمیل پاشا، نەجم الدین حسین، مەمدوح سەلیم، حەسەن حامید، فەریدو دکتۆر شوکری مەحمەد، حەسەن عەونی نوێنەری خەربووتی پێشوو، مەحمەد ناوێك کە نوێنەری پێشووی شاری مەلاتیە بووە، ئەمین زەکی، میر ئالا خەلیل بەگی دەرسیمی، مەحمود نەدیم پاشا، فەریق مستەفا پاشای سلێمانی، فەریقی حەمدی پاشا، قائمقام مەحمەد ئەمین بەگی سلێمانی، سەید عەلی شیرۆلی و سەید شەفیق ئەفەندی خێزانی و کەسانی تر، (بلە چ شیرکو، القضیة الکردیة)ص٥٢-٥٣ لە هەمان ساڵو هەر لەگەڵ دامەزرانی(کۆمەڵەی تەعالی کوردستان)یشدا، کۆمەڵەیەکی تری وێژەیی دامەزرا بەناوی(کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کورد)و یەکێ لە هەنگاوە گرنگەکانی ئەم ڕێکخراو و کۆمەڵە کوردییەش ئەوەبوو، قوتابخانەیەکی بەزمانی کوردی و لە(جنبرلی تاش)کردەوە بۆ فێرکردنی منالی ئەو ماڵە کوردانەی کەلەوکاتەدا لە شاری ئەستانە(ئەستەمبووڵ) بوون. بەلام هەرکە دەسەلات کەوتەدەس تورکە(اتحاد)یەکانەوە لە فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانیداو لە

ژێرپەردەی دەستوور و دیموكراتیدا هەردوو كۆمەڵەكەیان داخست و بەشێوازێكی دیكتاتۆریانە و دوورلە هەموو نەرێتێك قوتابخانە كوردی یەكەیان هەڵوەشاندەوە، بەڵام كۆمەڵەی تەعالی بەوەكۆڵینەدا بەڵكوپەنای بردەوەبەركاركردنی نهێنی و دوابەدوای ئەوە لە ساڵی١٩١٠دا كۆمەڵەی(هێڤی كورد) لەلایەن كۆمەڵێك لە خوێندكارانی كوردی ئەوكاتەوە كە لەشاری ئەستانەبوون بە هاندان و پاڵپشتی كردنی خەلیل خەیاڵی مۆتەكی پێكیان هێنا هەرلەدوای دامەزراندنی ئەم كۆمەڵەو ڕێكخراوانەشەوە كە لە ئەستانە(ئەستەمبووڵ)ی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی هاتنەكایەوە كۆمەڵێك ڕێكخراو و كۆمەڵە و پارتی سیاسی كورد لە ناوچەجۆر بەجۆرەكانی كوردستان و دەرەوەی كوردستاندا هەریەكەیان بۆ مەبەستێك و وەك داكۆكی كردنێك لە مافەكانی كورد لەو كاتە بەدواوە كەوتنە چالاكی بەردەوامەوە، هەریەكەشیان بەپێی ئەو دەرامەت و دەرفەتەی بۆی ڕەخسابوو بڵاوكراوە و گۆڤار و زمانحاڵی خۆیان هەبوو سەرەڕای كردنەوەی لق و بارەگای تایبەت بەخۆیان لە زۆر ئەو ناوچانەی ئەوكاتەی دەوڵەتی عوسمانیدا ئەوەش چ بە شێوازی نهێنی بێت یان بە ئاشكرا بەتایبەتی لە شارە دیارەكانی وەك: (دیاربەكر، موسڵ، هەولێر، سلێمانی، كەركوك وبەغدای) پایتەخت و شوێنانی تریشەوە تەنانەت بەزۆری ئەندامان و باڵەكانی ئەم كۆمەڵە و ڕێكخراوانەش بوون كە لەتەشرینی یەكەمی (١٩٢٧)دا و لە هاوینە هەواری(بحمدون)ی لوبنان بزوتنەوەی(خۆیبوون)یان دامەزران و هەموویان لە ڕیكخراوێكی سیاسیدا كۆبوونەوە كۆمەڵەی تەعالی كوردستانیش پاش دامەزرانی، پەیڕەوە ناوخۆییەكەی كە لە(٣٤) ماددەی جۆربەجۆر پێك هاتبوو لە ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی١٣٣٣كۆچی كە هاوكاتە لە ساڵی١٩١٥ی زایینیدا بە زمانی توركی بڵاوكردەوە وەك دەشبینی بەپێی

بڕگەی(٣٢)پەیڕەوی ناخۆکەی نووسیویە:(ئەم کۆمەڵەیە پێك هاتووە لەسەربناغەی یەکبوون و سەرکەوتنی گەل، لەسەر بناغەی بایەخدان بە دابی نەتەوایەتی و پەروەردەی ئیسلامی و ژیاریو ڕێزگرتن لە نەتەوایەتی لە نێوکوردانداو درێژەدان بە خۆشەویستی و یەکێتی لە نێوانیاندا هەموو ئەندامێکیش لە ئەندامانی کۆمەڵە ئەبێ پابەندبن بەم بنەمایانەوە) وەك لە درێژەی بڕگەکانی تری پەیڕەوی ناو خۆی کۆمەڵەکە ڕوون کراوەتەوە.[١٦]

---

[١٦] لە گۆڤاری(ئاران)ی، ژمارە(١٢)ی، کانوونی یەکەمی ١٩٩٩دا، بڵاوکراوەتەوە.

# باسی نۆزدەیەم

## شۆڕشی ئۆکتۆبەر و
## هێزەکانی سوپای ڕووس لە قەڵای شیروانەدا

پێش بەرپابوون و هەڵایسانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵە ١٩١٧ ڕووسیای تزاری(قیصری) تەوەرێك بوو لە وڵاتانی هاوپەیمان. دژ بە وڵاتانی ناوەند(وسط) لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨)دا بەڵام کاتێ شۆڕش بەرپابوو ڕابەرانی شۆڕشی نوێی ڕووسیا بە تایبەتی(لینین) یەکێکبوو لەوانەی کە یەکەم هەنگاوی ئەوەبوو وڵاتەکەی لە کارەسات و ڕیزەکانی جەنگ بکێشێتەوە و، خۆی بۆ پاراستنی شۆڕش و هێورکردنەوەی شۆڕشی ناوخۆی وڵاتەکەی تەرخان بکا هەر لەوکاتەوە و لە سەرداوای سەرانی سوپاکەیان سەربازێکی ڕووسی وەك عەمید شوکری مەحمەد ئەدیم ئەڵێ: لەبەرەی جەنگی عێراق و کوردستان لە ناوچەی بنکورەوە لە ٢ی حوزەیرانی ساڵی(١٩١٧)ەوە لە ئاوی سیروان دەپەڕێتەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو هێزانەی تورك کە لەوکاتەدا لە(قەڵای شێروانە)ی ناوچەی گەرمیان دابوون ئەوەیان پێ ڕادەگەیەنێ کەوا هێزەکانی ڕووس ئاگادارکراونەتەوە کە ئاگری جەنگ بوەستێت بەو شێوەیەهێزەکانیان بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ

باولۆف هەموو ناوچەکانی(دیالی) یان بەجێ هێشت(الندیم، الجیش الروسیی،ص٧٩) بەڵام هێزەکانی تریان لە ناوچەی سلێمانی و ڕەواندز وەکو خۆیانمانەوە. لە پاش جەنەراڵ باولۆف یەکێکی تری هاتە شوێن بە ناوی جەنەراڵ باراتوفەوە کە سەرکردەی ئەو هێزە ڕووسیانە بوو کە لە ٣ی حوزیرانی١٩١٦دا پەلاماری شاری(خانەقی)یاندا بەمەبەستی داگیرکردنی لەم کاتەدا هێزەکانی رشووسی خۆیان دەدا لە نزیکەی٢٠٠٠٠هەزار سەرباز سەرەڕای ژمارەیەکی زۆرچەکی هەمەجۆر و(٢٠)تۆپی دورهاوێژ و بەزۆری لە ناوچەی خانەقی و قەسری شیرین و قزڕەباتا جێگیرکرابوون لەمانگی نیسانی ١٩١٧دا هێزەکانی تورکی بە تایبەتی فەیلەقی (١٣)سیازدەیەمی لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروانیان چۆڵکردو، هێزەکانی ڕووسی کەوتنە جموجوڵ و خۆکۆکردنەوە لە شەوی ٧و٨ی مایسی١٩١٧ بەدوولیوای سوارەوە لە ئاوی سیروان پەڕینەوە یەکەمیان لە ژووروی ناوچەی مەیدانەوە بەرەو(باوەنور) و دوومیان لە شاخی(مرواری)یەوە بەرەو(قەڵای شێروانە) و لە ٩ی مایسی١٩١٧دا داگیریان کرد بەکەش هێزەکانی ڕووس داوایان لە جەنەراڵی بەریتانی(مۆد)کرد کە تائەوکاتەش هاوپەیمانی یەکتربوون لە جەنگدا یارمەتیان بدا بۆ ئەوەی پەلامارنەدرێن لەلایەن هێزەکانی تورکەوە لە ناوچەی(دەلی عەباس) و(عزێم)ەوە بتوانن خۆیان بگەیەننە هەرێمی کفری، کەچی جەنەراڵ مۆدی بەریتانی ئەمەی نەکردو هێزەکانی تورکیش بە سەرکردایەتی عەلی ئەحسان پاشا توانیان بە هێزێکەوە کە پێك هاتبوو لە لیوایەك پەلاماری هێزەکانی ڕووسبدەن بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەبەری(مەیدان)ەوە پەڕیبوونەوە و، لەناوچەی(سەید خەلیل)یشدا بنکەیەکی تری بەرگریان دژی هێزی ڕووسی دامەزران بە(٦) فەوج و بەیارمەتی(٣) بەتەریەوە پەلاماری ئەو ڕووسانەیاندا کە لە قەڵای

شێروانەدابوون ئەمەش لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروان و وڵاتی ئێران دیاردەیەکی واش ئەوە دەسەلمێنێ کەجۆرە لاوازییەك لە هاوکاری و پشتگیری هەردوو سوپای ڕووسی و بەریتانیدا بە تەواوی دەرکەوتوە و بەریتانیەکانیش زانیویانە کەڕووس لە هاوپەیمانی و بەرەی جەنگ دەکشێتەوە هەر بۆیەش لە زۆرلایەنەوە بەتەنگی یەکترەوە نەچوون دژ بە دەوڵەتی عوسمانی سوپای تورك هەرچەندە سەرانی ڕووسی بارەگای سوپای بەریتانیەکانیان ئاگادارکردەوە لەوەی کە ئەوان ئەیانەوێ(١٦)سریەی سوارە و(٥)فەوج و(٦)گوللە تۆپ بەجێ بێڵن لە ناوچەی قەسری شیرین و خانەقی و ئەو هێزانەی تریشیان دەکشێنەوە بۆ(هارون ئاباد) لەبەر ئەوەی نەیانتوانیوە لە ڕووی خۆراك و ئازوقەوە سوپاکەیان بەڕێوەببەن و لە هامان کاتا لەلایەن خێڵە کوردەکانەوە بەتەواوی تەنگیان پێهەڵچنرابوو لە١١ی مایسی١٩١٧ەوە جەنەراڵ باولۆڤ فەرمانیدا بەوەی کە هێزەکانی لە ڕێگای کرماشان-هەمەدانەوە بکشێنەوە و، بەوەش هیچ هێزێکی ئەوتۆیان لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیرواندا نەما تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کەلە ناوچەی شارەبان و چیاکانی(حەمرین) دامانەوە ئەوانەش پشتیان بە هێزەکانی بەریتانیای هاوپەیمانی خۆیان دەبەست. بۆ ئەوەی لە ڕووی خۆراك و پارمەتییەوە کۆمەك دەسگرۆیی بکرێن ژمارەشیان خۆی دەدا لە نزیکەی١٠٠٠ هەزار سەرباز و، سەرهەنگ(بیچاراکۆڤ) ڕابەرایەتی دەکردن. ئەم هێزانە لەگەڵ هێزەکانی بەریتانیادا مانەوە تا ساڵی١٩١٨ و، زۆرجاریش لەگەڵ سوپای تورکدا بەجەنگ دەهاتن یەکێ لەوانەش کەشان بەشانی سوپای بەریتانیا دژ بەتورکەکان کرد بێتیان شەڕی(قەرەتەپە)ی ٣-٤ی کانوونی یەکەمی١٩١٧بوو پاشماوەکانی ئەم هێزانەش لە دواییدا گەڕایەوە بۆدیوی ئێران و شاری کرماشان لە سەرەتای کانوونی دووەمی١٩١٨دا دوا

سەربازی ڕووسی خاکی عێراق و کوردستانی باشووریان بەجێ هێشت و بەیەکجارەکی خۆیان لە ڕیزی هاوپەیمانەکان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کشانەوە.[18]

[17] ئەم باسە لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە(١٢٥٥)ی١٩٩٦/٤/٥ ڕۆژی هەینی بڵاوکراوەتەوە.

[18] ئەم نووسینە لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ) ژمارە (٨٨٤)، سێشەممە ١٩٩٥/١/١٠ بڵاوکراوەتەوە.

# باسی بیستەم

## زانای كورد تۆفیق وەهبی
## لە بەڵگەنامەیەكی سەربازی عێراقیدا[١٨]

پێم وابێ، ئاشكراكردن و دۆزینەوەی هەر بەڵگەنامەیەكی بڵاونەكراوە سەبارەت بە كورد و، گەورە پیاوانی سیاسی و ناوداری كورد سوود و بایەخێكی ئێجگار گەورەی دەبێ بۆ سەرباری گەشەكردن و ڕووناكبیری كوردی، بە هەموو بەشەكانییەوە بەڵگەنامەیەكی لەم بابەتەش كەمن لێرەدا دەیخەمە ڕوو ڕەنگە وەك ناوەڕۆك شتێكی وامان نەداتەدەستەوە و هیچ لایەنێكی نەوتۆمان بۆ یەكلایی نەكاتەوە. بەڵام وەك بەڵگەنامەو لەوسەربەندەدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ كە زانایان و گەورە پیاوانی ڕووناكبیر وسیاسی كورد ڕۆڵ‌و شوێنێكی تایبەتیان هەبووە لە مێژووی هاوچەرخی عێراق بە گشتی و گەلی كورد بە تایبەتی‌و، بەشداربوونیان لە بەرەوپێش بردنی ڕەوڕەوەی دەسەڵات و حوكمڕانیەت لەم وڵاتەدا جا سەبارەت بە بیریار و زانایەكی وەك تۆفیق وەهبی(١٨٩٢-١٩٨٤)هەر چەندە لێرەدا پێویست بەوە ناكا كەبڵێم: ئەم گەورە پیاوەی كورد كێ بوە و كارەكانی كامەن لە بواری

[١٨] ئەم نووسینە لە ڕۆژنامەی(كوردستانی نوێ) ژمارە(٨٨٤)، سێ شەممە ١٩٩٥/١/١٠ بڵاوكراوەتەوە.

کوردایەتی و ڕووناکبیری کوردیدا چونکە بەزۆری هەموو سیاسەت مەدارو ڕووناکبیران دەزانن کە ئەو مرۆڤە مەزنە چ خزمەتێکی بە وڵات و میللەتەکەی خۆی کردوە و، چۆن شەوو ڕۆژی داوەتە دەمی یەکتر بۆ ئەوەی خزمەت بە باری ڕووناکبیری نەتەوەکەی بکا هەر لە کاروباری ئیداری، سیاسی، سوپایی، دیبلۆماسیەت، زمانەوانی سەرەڕای مێژووکاری ڕۆژنامەنووسی...یانی دەرگا نەبووە کە کلیلی دەستی ئەم پیاوە نەیکردبێتەوە و ناواخنەکەی تاووتوێ نەکردبێ بۆ ئەمەش من بە ئەوپەڕی ڕاشکاویەوە دەڵێم: کە مێژوو و ڕووناکبیران هەربە خۆیان ئەوگەواهەی بۆدەدەن و پەنجەی شەهادەتی بۆ دەخەنە سەرخاڵی مەبەست هەر لەو ساڵانەشدا کە خوێندکاری بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیات بووم بەردەوام ئەوکتێبخانانەم دەپشکنی کە کتێبی کۆن و گۆڤار و نووسراوی دانسقەیان تیابوو یەکێك لەو کتێبخانانەش کە زیاتر لەم لایەنەوە دەوڵەمەند بوو کتێبخانەی (نتول) بوو لە(باب المعظم) نزیك بە کۆلێژی ئاداب ئەوی ڕاستی بێ تابڵێی شتی دەگمەنی تیابوو هەر لە ڕۆژنامەی کۆن، گۆڤار و کتێب و... بۆ یەکێك خولق و تاقەتی ئەوەی هەبوایە بەدوای بابەتی بەکەڵکدا بگەڕێ ئەوەبوو ڕۆژێك هەر لە کتێبخانەکەدا گەلێك گۆڤار بە زمانی فارسی و کتێبی جۆربەجۆری کۆنم بەر چاوکەوت زۆریان لەلاپەڕەی یەکەمیانداولای سەرەوەیاندا بە ناووئیمزای(ئاسیا تۆفیق وەهبی)ەوە لە سەریان نووسراوە کەدوایش لە بارەی ئەم(ئاسیا)یەوە پرسیارم کرد بۆم دەرکەوت کە ئەمە خێزانی تۆفیق وەهبی بەگبووە. بەڵام لە ڕاستیدا من وای بۆدەچووم کەکچی بووبێ؟ لەبەرئەوەی بابەتەکان نرخیان گەلێك گران بوو منیش قوتابی بووم و توانای کڕینیانم نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ هەندێکم لێ تاوتوێ کردن و لە دووتوێیەکێ لەو گۆڤارانەدا ئەم بەڵگەنامە سەربازیەم(عسکری)م

بەرچاوکەوت و، ئەمیانم لای خۆم گل دایەوە چونکە زانیم ئەمەیان بایەخدارترو بەکەڵك ترە لای خواریشەوە واتۆمارکراوە مێژووی دەرچوون و بڵاوکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ(١٩٥٢/١/٢) و ناوی هەردوو گەورەپیاوی سەربازی و سیاسی کورد(تۆفیق وەهبی بەگ) و (نورالدین محمود)ئەمەی دواییان کە دەڵێن بەرەگەز کوردبووە بەسەرەوە بوو لەگەڵ ناو و ئیمزای هەردووگەورەپیاوی شۆرشگێڕوناسراوی عێراق(عبد الوحد حاج سکر) کەیەکێك بوە لە ڕێبەرانی شۆڕشی٣٠حوزەیرانی ساڵی١٩٢٠ لە عێراقدا لەگەڵ ناوی(حسین مکی خماس) ئەو زانا گەورەیەی کە لەودەمانەداو پێش ئەوەش ماڵی لە بەغدا بووە و لە ئیش و کاری دەوڵەتدا وەك زۆرکەسایەتی تری کورد کاربەدەس بووە و تەنانەت شوێنی ماڵەکەشی کەوتۆتەلای دەسەچەپی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغداوە و، لەم ماوەیشدا بەشی ڕاگەیاندن(الأعلام)ی هەمان کۆلێژ لەم کۆشکەدا، دەوامیان ئەکرد کە پێشتر ماڵی تۆفیق وەهبی بووە. لەسەردەرگای دەرەوەی ئەم بەشەو ماڵەکەی مامۆستا وەهبی کۆندا بە پارچە ئاسنی هەڵکۆڵراو بە پیت و نووسراوی ئینگلیزی لێی نووسرابوو١٩٤٢TW واتە (تۆفیق وەهبی١٩٤٢) ئەم تۆمارە مێژووییەش ئەوەمان بۆ دەسەڵمێنی کە ئەم خانووەی مامۆستای کۆچکردوو لە ساڵی١٩٤٢دا دروست کرابێ یان ئەودەرگایە لە ساڵی ناوبراودا بۆ ئەوخانوە دروست کرابێ.

ئەمەش بۆ خۆی بەتەواوی مەیلی هەموو کورد و کەسێکی ڕووناکبیری تازەدەکردەوە ئەو زانا گەورەیەی کوردی دەهێنایەوە یاد کەچەندین ساڵ لەوێدا ژیانی بەسەر بردبێ و، چەندین یادگار و سەربردەی لەم دەوروبەرەدا هەبووە لێرەداو بۆ سودی گشتی وبۆ مێژوودەقی ئەو بەڵگەنامەیە بڵاودەکەمەوە و دەیخەمە بەردەستی هەموو خوێنەر و

ڕووناکبیرێك کە دڵنیام لە تایبەتمەندی و سودی خۆی بەدەرنییە هەر چەندە حەزیشم دەکرد بەڵگەنامەکەی بەفۆتۆکراوی لەگەڵدا بوایە. بەلام لەبەرئەوەی نووسینەکەی زۆرکاڵ بۆتەوە و لە(فۆتۆکردن)دا دەرنەچوو بۆیە تەنها دەقەکەیم وەکو خۆی نووسیەوە کە بەزمانی عەرەبی بوو لێرەدا بلاوی دەکەمەوە.

دەقی بەڵگەنامەکە بە زمانی عەرەبی:

لجنة الأمور العسكرية

العدد: ع/٢٨

التأريخ: ١٩٥٥/١/٢

فخامة الرئيس مجلس الآعيان المحترم

الموضوع: لائحة قانون تعديل قانون خدمه الأحتياط في الجيش الرقم٥٨لسنة١٩٢٨ رقم() لسنة١٩٥٤

اجتمعت اللجنه في الساعة الحاديةعشر من صباح يوم الأحد المصادف ١٩٥٥/١/٢ في لائحة قانون تعليل قانون خدمه الأحتياط في الجيش رقم٥٨لسنة١٩٢٨ رقم() لسنة١٩٥٤ المحال اليها من مقام الرئاسة مع كتاب مجلس النواب المرقم٢٥٠ والمؤرخ ١٩٥٤/١٢/٢٧ او لدى المذاكرة حولها قررت قبولها و توصية المجلس العالي بالموافقة عليها كما جاءت في مجلس النواب...

| | | |
|---|---|---|
| عبد الواحد حاج سكر | توفيق وهبى | حسين مكى خماس |
| عضو | عضو | عضو |
| | | نور الدين محمود |
| | | رئيس اللجنه |

# باسی بیست ویەك

## مێژوو لە نێوان حەقیقەتی مێژوو و بۆچوونەكانی فازیل كەریمدا

بەپێی ئەو شارەزاییە كەمەی لە بواری مێژوودا هەمە بە تەواوی ئەوەم لاڕوون بۆتەوە كەكاری مێژوونووس و لێك دانەوە و تەتەڵەكردنی لێكۆڵینەوەی مێژوویی هەرزۆرگران و دژوارە بۆیەكێ بیەوێ لەم بوارەدا خۆی قاڵ بكاو، بە ئەمانەتێكی پاكەوە، هەموولایەنەكانی بە جۆرێك لێك بداتەوە كە ڕاستگۆیی، دڵسۆزی و گیانی مەوزوعیەت بە تەواوی و، ڕاشكاویەوە لە نووسینەكانیدا ڕەنگبداتەوە، بە جۆرێكی وا كاتێ خوێنەرێ یا توێژەرێكی زانستی موتالای لەسەر دەكاو بە ناخی لاپەڕەكانیدا دەچێ بگاتە ئەو قەناعەت و بۆچوونەی وا بزانێ بابەتێ دەخوێنێتەوە یا لێكیدەداتەوە، وای لێ بكا، لە ئەنجاما بگاتە سەرچاوە و ڕێڕەوێكی وا كۆمەڵێ زانیاری و بابەتی بایەخداری لاگەڵابێ لێرەشدا نامەوێ درێژە بدەم و ئەمەوێ بچمە سەر ئەسڵی مەبەست، ئەویش ئەوە بەوماوەیەیپێش ئێستا زانیبووم نووسینێكی برای ڕووناكبیر فازیل كەریم لە وڵاتی ئەڵمانیاوە گەیشتۆتە ڕۆژنامەی(كوردستانی نوێ)ی ئازیز ئەوەشم زانیووكە

نووسینەکەی کاك فازیل لە بارەی کتێبە بایەخدار و ناوازەکەی زانای گەورە و مامۆستام دکتۆر کەمال مەزهەرە. بەڕاستی چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە کاك فازیل بەگیانێکی مەوزوعیانەو بە تەتەڵەکردنێی بایەخدا رەوە لاپەڕەکانی(مێژوو)لێك بداتەوە و تاوتوێیان بکا هەرچەندە کاك فازیلٚ بە نووسینەکەی گەلێ بۆ چوونی خستۆتە بەرچاو و مایەی دڵسۆزی و دڵ خۆشکردنە و هەنگاوێکی گەرم وگوڕ ئەداتە باری ڕووناکبیریی کوردیمان بەڵام لەهەمانکاتا من وای بۆ ئەچم گەلێ بۆچوونی وای تێدایە کە نەدەبوو کاك فازیل بەوجۆرە باسی زانای گەورە دکتۆر کەمال و نووسینەکانی دکتۆری بکردایە. بەڕاستی لە شوێنیوادا، قسەی وای تۆمار کردوە ئینسان کە دەیانخوێنێتەوە، شەرم دەیانگرێ بە تایبەتی لەسەر کە سایەتی و زانا و پرۆفیسۆرێکی گەورەی وەك دکتۆر. هەرچەندە دەیان و سەدان نووسینی وای لە بارەوە بنووسرێن بڕوا ناکەم بە قەد تۆزقاڵێك لەکەسایەتی دکتۆر کەمال و نووسینە بایەخدارو گرنگەکانی کەم بکەنەوە و بتوانن لە ئاستی زانستی و مەوزوعیانەی ئەوی بکەن دکتۆر کەمال کەساڵانە دەیان بڕوانامەی زانستی دکتۆرا و ماستەر لە زانکۆبەرزەکانی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە بواری مێژووی نوێ و هاوچەرخدا موناقەشە ئەکا و تا ئێستا سەدان وتار و لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی گەورە و بەکەڵکی بڵاوکردۆتەوە بگرە دەیان کتێبی بەدەسنوسی ماونەتەوە و، تا ئێستاش ڕووناکیان نەدیوە سەرەڕای ئەو هەموو شەونخونی و خۆماندو کردنەی لە بواری خزمەت کردن بەمیللەتی کورد و بەمرۆڤایەتی بەجۆرێ ئینسان ناتوانێ چۆن تەعبیر بکاو چۆن بیان نرخێنی کاتێ ئەم قسانەش دەکەم، مەبەستم ئەوە نییە کە بڵێم: لە نزیکەوە دکتۆر کەمالم ناسیوە و یا لێرەدا دیفاعی لێ ئەکەم بەڵکو هەموو نووسین و هەڵوێست و لێ بووردویی ئەو کەڵە پیاوەی

مێژوو خۆی ئەكەمە شایەت و هەموو ئەو كەسانەش ئەكەمە سەر پشك كە بەویژدان و گیانی زانستییەوە ئەڕواننە دكتۆر كەمال و یان لەنزیكەوە دەیناسن،دكتۆر كەماڵ بە قەد خۆشەویستی هەموو خۆشەویستیەك هەموو ئینسانێكی ڕووناكبیری خۆش ئەوێ و كاتێ كەسێ ڕووی تێدەكات بەرزەپێ لەبەری هەڵئەستێ و وەك پێویست ڕێزی لێ ئەگرێ و گوێی لێ ئەگرێ و، كتێبی پێشكەش ئەكا، یانی ئەوەی لەوزە و توانای ئەودابێ و بەوبكرێ بۆی جێبەجێ ئەكا. سەرەڕای ئەوەش كە زۆربەی نا ڕووناكبیری كورد ڕەقە بەرایەتی ئەكەن و، حەسادەتی پێ ئەبەن. تەنانەت جاری وا هەبووە ئەوەندە نەیانتوانیوە لە نرخی نووسین و كەسایەتی كەم بكەنەوە بۆ نموونە زۆڵە كوردی واهەبوون:(پەنایان بردۆتەبەر دەمانچە هەڵكێشان) لە پیاوێكی وا؟! لە حاڵێكدا تاوەكو كوردمابێ و بەئەوپەڕی قەناعەتەوە ئەم قسەیەم دەكەم ڕەنگە قەت دكتۆر كەمالێكی تری وای تیا هەڵ نەكەوێ. دیارە ئەم بۆ چوونەشم لەوەوە سەرچاوە ناگرێ كە خوانە خواستە بڵێم: كەس ناتوانێ ڕچەیەكی وابشكێنێ و بگاتە ئاست و پلەیەكی لەوبابەتە، بەڵكو مەبەستم ئەوەیە زانایەكی وەك دكتۆر كەمال گەیشتۆتە ئاست و سەدایەكی وای لە ناو باری ڕووناكبیری مرۆڤایەتی داچاندوە، پێویستە هەموو كەسێك بەڕوحیەتێكی پاكەوە شانازی پێوەبكا و، بۆچوون و سەرنجەكانی لە بواروكاری زانستیدا تاووتوێ بكا. چونكە بەڕاستی من قەت بەجوانی نازانم بۆ یەكێكی وەك كاك فازیل بێ بەڵگە بڵێ د.كەمال لە كتێبی مێژوو و بەرهەمەكانی تریشی ئەم لاوازیە تیوریە بەزەقی دەردەخات. ئیدی لەسەر هەر باسێكی نووسیبێت دەتوانرێ بە ئاسانی چەندین كەموكوڕی لێوە دەستنیشان بكرێت. ئەگەر هەر كەسێ بیەوێ ڕەخنە لەسەرجەمی نووسینەكانی بگرێ دەبێ ئەوەندەی بەرهەمەكانی

کتێب بنوسێ تاهەڵەو کەم و کورپەکانی دەسنیشان دەکرێت) من نازانم کاك فازیل لـە پـای چـی ودوای کـام ئـەزموون، ئەوخەتـە ڕاست و چەپـە ئەداتـە سەردکتۆر کەمال‌و بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ باری ڕووناکبیری و ڕووناکبیری کوردیدا دەکا لە کاتێکدا دکتۆر کەمال خۆی لـە کۆتـایی کتێبەکـەیدا ئـەوەی بۆ هەموو خوێنەر و ڕووناکبیران ڕوون کردۆتەوە و وتویـەتی:(هیـوادارم لـە هیچ کـامێك لـە لایەنـەکانی مێـژوودا هەڵەیـەیا کەمتەرخەمییەکی ئـەوتۆم بەسەرداتێنەپەڕیبێ ئەوی لەوێزە و تواناما‌دابوو کردم و ویستم بەرهەمێکی بەکەڵك و بایەخ پێشکەش نەوەی ئیمرۆ و هیوای دوا ڕۆژمان بکەم و دیسان پەنادەبەمەوە بەرباوکی گەورەی مێژوونووسی کوردی شەرەفخانی بەدلیسی و لە زمان ئەوی پایەبڵندەوە منیش دەڵێم:( لەزانایانی پیـاو چـاك و دڵپاك و بـەوەج دەپاڕێمـەوە زۆر بـەوردی لـە نووسـینەکەم وردببنـەوە و ئەگـەر پەشێویەکیان بـەر چاو کـەوت بەشـێوەیەکی مەردانـە بـەراوردی بکـەن خـۆ ئەگەر هەڵەو لـەبیرچوونێکم لەسـەر دەدۆزنـەوە هـەر بـە گاڵتـەپێ کـردن و تیزوتەشەر لێم نەقۆزنەوە، پیاوەتیم لەگەڵ بکەن و بەپارچەیەکی چاکتر و بە بزگورێکی تازەتر و پاکـتربۆم پینەبکـەن مێـژوو، ل٢٦٠" بـەپێی ئەمـەش دکتـۆر کـەمال قـەت نـەیوتوە من بـە هەڵـەدا نـەچووم و یـان هەرشتێ مـن نوسیبێتم ئیدی هەر هـەموویان سـەد لەسـەد ڕاستن، بـەڵام ناشبێ ئینسان بەبۆچوونێکی وا لە کەسێکی‌وا و لە نووسینی کە سێکی وا بڕوانێ ئـەوەتا هـەر لـە سـەرەتای نووسـینەکەیەوە کـاك فـازیل نووسـیویە:(شـتێکی سـەرەتایی‌یە کە قوتـابی بۆ نووسینی هـەر بابـەتێك دەبـێ بزانـێ پێـش نووسین دەبێ"کۆنسێپت Konsept"ی دانابێ واتە پێش نووسین دەبێ پلانێکی ورد بـۆ خـۆی دانـێ کەبەتەمایـە چی بکات" منیش لەگـەڵ ئـەو ڕایەدام بەڵام ئەمەیان نەك بۆ هەمووکەسێ: بەڵکومەسەلەی پلان دانـان بـۆ

کاری نووسین زیاتر بۆ ئەوانەیە کە کەم ئەزموون و کەم تەجروبەن و تازە خەریکی لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردنی نووسینن جاخۆ کاکە کەسێکی وەك دکتۆر بۆ هەموو ئەو پلان و(کۆنسێپت) ئانەی کە جەنابتان باسی لێوەدەکەن مەعقول نییە تا ئێستاو دوای ئەو هەموو ئەزموونەی زانست و نووسین هەر هەمووی لە مێشکی خۆیدا هەزم نەکربێ و، پەنایان پێ نەبا وەك و توتانە:(داخەکەم د.کەمال مەزهەر هەر چەند خاوەن دکتۆرا و ناو کە من هێشتا هەر سەر دەرناکەم لە بڕوانامەکەی ئەو کە لە زانیاریدا وەریگرتووە بەڵام زۆرجار نە پێشنووس "Konsept"ی لە بەرچاو گرتووە و نەوردی پیشانداو لە دارشتن و دەربڕیندا) چونکە دکتۆر کەمالێك وەکو پێشتر وتم: ساڵانە دەیان قوتابی دکتۆرا و ماستەری هەبێ و بەزۆری هەر خۆشی ئەندام یا سەرپەرشتیاربێ لە موناقەشەکردنی بڕوانامەکانیاندا ئیدی ئەگەر ئەوێ تا ئێستا لەوانەی جەنابتان نەگەیشتبێ و یاپەی پێ نەبردبن چۆن ئەو هەموو ئەرك و کارانەی ڕۆژانەی خۆی یەکلایی دەکاتەوە، خۆ ئەگەر دەتەوێت زیاتر لەم شارەزایی‌و لێهاتوویەی دکتۆر بگەی فەرموو وەرەوە کوردستان و خۆت بەچاوی خۆت کارەکانی ببینە یان هەر لە ڕێگای نامەیەکەوە بۆ کۆلێژی ئەدەبیاتی-زانکۆی بەغدا- بەشی مێژوو بۆ بنێرە و من دڵنیام لەوەی دکتۆر کورتە(ملخص)ێکی کارەکانی خۆیت بۆ ڕوون دەکاتەوە یان خۆ بتەوێ من ئەتوانم زۆر لە پرۆژەکانی مامۆستات بۆ ڕوون بکەمەوە. بەداخەوە(لێرەدا ئەو بوارە کەمە و ڕەنگەزۆر بکێشێ) دوابەدوای ئەمانە کاك فازیل هاتوە ڕەخنەی ئەوە لە دکتۆر دەگرێ کە گوایە باسی کۆماری ڤایماری ساڵی ١٩١٩ی نەکردووە حەز ئەکەم تۆ ئێستا لە وڵاتی ئەڵمانی‌و ئەتوانی هەر لەوێوە پرسیارێك لە چۆنێتی دروست کردنی ئەو کۆمارە بچوکەی وڵاتی ئەڵمان و دوابەدوای جەنگی یەکەمی

جیهانی(١٩١٤-١١-١٩١٨/١١/١١) بگەی و بزانی بەچ جۆرێك دامەزراوە و هەر چەندە دڵنیاشم لەوەی کە هەر کۆماری قایمار بوو، بووبە بنەمایەك بۆ سەرلەنوێ دروست بوون وپێك هێنانەوەی دەوڵەتی ئەڵمانی و تەنها(مقاطعە) یەکی بچوکی گرتەوە کە ژمارەی دانیشتوانی لەو سەردەمەدا نەدەگەیشتە(٨٠٠٠٠)هەزارکەس سەرەڕای ئەمانەش کاك فازیل هاتوە رەخنەی لەوەدا لە دکتۆر کەمال گرتووە گوایە ئەو ناوی چەند کۆمەڵەو رێکخراوێکی کوردی تۆمارکردووە و بەهەڵە و بەبێ سەروبەر رێکیانی خستوە و تەنانەت ناوی هەندێکیانی بە هەڵە تۆمارکردووە وەك نووسیویە:(لەوەرگێڕانی نێوی رێکخراوەکان باشی نەپێکاوە (کورد قادینلری تعالی جمعیتی) نابێ (بەکۆمەڵی بەرزی ئافرەتانی کورد) وەربگێڕدرێت (تعالی) واتای (پێشکەوتوو) دەگرێتەوە نەك بەرز (کۆمەڵی بەرز) لەمەشدا بەکاك فازیل دەڵێم: لەمەشیاندا هەرچەندە ئەو ناونیشانە ناونیشانێکی تورکیەو بەو زمانە تۆرمارکراوە بەڵام وشە یا زاراوەی (تعالی)یە کە بێ شك بنەماکەی لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوەو لەبەرئەوەش زۆربەی زۆری زمانەکانی رۆژهەڵات تۆ بتەوێ‌و نەتەوێ یا بەهەڵەیان دابنێی‌و دانەنێی ئەوا کارتێکردنی زمانی عەرەبیان بەسەرەوەیەو ئەسڵی وشەکەش (تعالی) عەرەبییەو لە بەرامبەر (بەرز)ی کوردیە یا ئەگەر واش نییە خۆزگە کاك فازیل وشە یا زاراوەیەکی تری بۆ دەستنیشان دەکردین کە بەزمانی تورکی واتای (بەرزی) بدایە بەدەستەوە بەتایبەتی زاراوەی کۆنی تورکی کە دەقاو دەق لەگەڵ ئەم وشە یا زاراوەیەدا بگونجێ.

پاشان کاك فازیل هاتووە لە بابەتەکەی خۆی لای داوەو چۆتە سەر کتێبێکی تری دکتۆر کەمال کە ئەویشیان کتێبی یاخود بڵێین نامیلکەی (ئافرەت لە مێژوودا) کەیەتی کەلە ساڵی ١٩٨١دا بڵاوی کردۆتەوە. گوایە

دکتۆر کەمال کەوتۆتە هەڵەیەکی زەقەوەو یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتانی کوردستانی بەو پێیە تۆمارکردوە کەلە ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە. ئەوەشی لەبیرچۆتەوە کە پێشتر خۆی وتویەتی یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتی کوردی لە ساڵی ١٩١٩دا دامەزراوە. جا نازانم کاك فازیل بۆ بەو دەرەجەیە لێکی دەداتەوە کە دکتۆر ئەو مەسەلەیەی لەبیرکردووە یا نەی زانیوە، چونکە زیاتر جەخت کردنی دکتۆر بۆ مەسەلەی دامەزرانی کۆمەڵەی ئافرەتانی کوردستانی ساڵی ١٩٤٦ زیاتر پابەندە بەکۆماری مەهابادەوەو مەبەستی لە دامەزرانی ئەو کۆمەڵەیە لە مێژووی ئەو کۆمارەداو باسی مینا خانی هاوسەری قازی مەحمەدی نەمر (١٩٠١- ١٩٤٧)ی کردوە ئەمە لەلایەك لەلایەکی کەشەوە پێویستە کاك فازیل چاك لەوە بکەیشتایە نووسینی هەر مێژوونووسێك یا لێکۆڵەرێکی بواری مێژوو تەواوکەری یەکن‌و یا هەریەکەشیان لەبارەی کات‌و زەمەنێکی تایبەتەوە بێ وەکو جەنابتان دەڵێن دکتۆر خۆی پێشتر باسی ئەوەی کردوە کە یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان لە ساڵی ١٩١٩دا دامەزراوە. جا باشە تۆ بڵێی دکتۆر کەمال لەم قسەیەی خۆی یان لەم بۆچوونەی خۆی پەشیمان بووبێتەوە بۆیە وتویەتی: "مینا خانی هاوسەری قازی مەحمەدی نەمر لە ڕۆژگاری کۆماری مەهابادا جێگەی حەپسەخانی نەقیبی گرتبوو، وا دیارە خەریکی دامەزرانی یەکەم ڕێکخراوی ئافرەتان بووە" کەچی لەلایەکی کەشەوە کاك فازیل وەك نووسینەکانی دکتۆر کەمالی بەرچاو نەکەوتبێ هاتووە (اتهام)ی ئەوەی کردوەو، وتویەتی: "د. کەمال بەوردی شارەزای بزاڤی سیاسی ئەرمەنەکان نەبێت لەدوا چارەکی سەدەی ١٩، هەروەها نەشیتوانیوە بەوردی ستراتیجی زلهێزەکانی ئەو سەردەمەی دونیاو سەرجەمی پەیوەندی نێو نەتەوەیی بەرامبەر ئەرمەن بخاتە ڕوو". من لێرەدا هیچ وەڵامێکی وا بۆ کاك فازیل

ڕوون ناکەمەوە، تەنها ئەوە ئەڵێم: ئەگەر بهاتباو کاك فازیل چاوێکی بەکتێبە ناوازەکەی دکتۆر کەمالدا بگێڕایە واتە (کوردستان لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا- کردستان فی سنوات الحرب العالمیە- الأولی)داکە تا ئێستاو لە سەرەتای لە چاپدانییەوە چەند جارێکی تریش چاپکراوەتەوەو سەرچاوەیەکی هەرە گرنگی مێژووی هاوچەرخی کوردە، پێویستە لەسەر هەموو ڕووناکبیرێك هەر هیچ نەبێ جارێك ئەو کتێبە بخوێنێتەوە کە یەك بەشی (فصل)ی تەواوی لەبارەی کوردو ئەرمەنەوەیە. ڕەنگە کاك فازیل بەوە وەڵامی من بداتەوەو بڵێ: کاکە من مەبەستم: "دوا چارەکی سەدەی ١٩"ەیەو ئەو قسانەی کە ئێوەومانان ئەیڵێن‌و ئەو کتێبەی ئێوە باسی لێوە دەکەن لە سالآنی جەنگی یەکەم‌و ئەو سەرو بەندە ئەدوێ (!) بۆ ئەمەش ئەڵێم: هیچ ڕێی‌تێ ناچێ بۆ مێژوونووسێکی وەك دکتۆر کەمال و زانایەکی وەك ئەو کە چەندین ساڵ لەوڵاتی شورەوی بووبێ و بڕوانامەی بەرزی لەوێ وەرگرتبێ کاك فازیل واتەنی شارەزایی لە بارەی نەتەوەیەکەوە نەبێ کە زۆری لە چوارچێوەی ئەو وڵاتە ژیابن یان نووسین و ڕاوبۆچوونی لەسەر نەتەوە و گەلێك بڵاو بکاتەوە کە هیچ شارەزاییەکی مێژوویی دێرین و پێشووتری لەسەرنەبێ جگە لەوەش دکتۆر کەمال وەکو من پێی بزانم بایەخی بە ئەرمەنەکان و ڕووناکبیری ئەرمەن داوە و لەوانە لەدەستنووسێکی خۆیدا و بەزمانی عەرەبی کە ئێستا نوسخەیەکی(فۆتۆ) کراوی لای منە تیایدا ناوی زۆربەی نووسین و وتارو کتێب و لێکۆڵینەوەکانی خۆی تۆمارکردوە و لەوانەش نووسینی سەبارەت بە ئەرمەنی وەك:(ما تیندا متحف المخطوطات الآرمنیة-جوهرة الشرق الثقافیة) کە بەزمانی کوردی و لە گۆڤاری(بەیان) ی ساڵی(١٩٧٥)دابڵاوی

كردۆتەوە سەرەڕای ئەوەش بابەتێكی تری لە هەمان بواردا و لە گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد- بەشی عەرەبییەكەیدا بە ناوی(الأكراد و المذابح الآرمنية)ی بڵاوكردۆتەوە ئەمەش بۆخۆی بەشێك لە كتێبی(كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى) دەگرێتەوە، لەلایەكی كەشەوە كاك فازیل هاتووە لەوەدا ڕەخنە لە دكتۆر كەمال دەگرێ ئەو ڕێچكەی مێژوو نووسە كلاسیكیەكانی گرتوە و وەك دەڵێ : "ئەو كە لێنەی لەسەرجەمی نوسینەكانی د. كەمال دەردەكەوێ ئەوەیە كە زۆرجار ملی ڕێگای مێژوو نووسەكلاسیكیەكانی گرتووە و هەوڵی داوە بزانێ(چی) ڕووی داوە و زانیاری و بەسەرهاتەكانی دەپاڵ خستوە" جا باشە كاك فازیل ڕچە گرتنێكی وا خۆتان واتەنی بۆ(كەلێن)بێتۆ بڵێی ئەمانە هەر هەموویان بەڵگەی بایەخدارو گەورەنەبن بۆ دەقیقی و وردبینی دكتۆر كەمال لە لێكدانەوە و تەتەڵەكردنی لێكۆڵینەوەی مێژوویدا چونكە دكتۆر كەمال خۆی قەناعەتی تەواوی بەمەسەلەی(نقد والتحليل) واتە ڕەخنەوشیكردنەوە هەیە لە بواری لێكۆڵینەوەی مێژوویی و تاوتوێ كردنی لایەنە گرنگەكانی كاری مێژوویدا تەنانەت جارێكیان لە ڕۆژنامەی(الثورە)ی بەغدادیەوە و لە چاوپێكەوتنێكیدا ئەوەی بۆ ڕۆژنامەنووسی عێراقی(حميد المطبعي) ڕوون كردبۆوە كە ئەو واتە دكتۆر كەمال بڕوای بە(نقد والتحليل) هەیە لە كاری مێژوویی و هەڵسەنگاندنی ئەو ڕووداو سەربردە مێژوویانەی كە دەچنە ناو منداڵدانی مێژووەوە هەروەك خۆشت و تووتە:(ئەم شێوازەش گرنگی خۆی و پێویستی خۆی هەیە و هەرلە زەمانی هیرۆدۆتەوە تا ڕۆژی ئەم ڕۆ پەیرەوی كراوە) ئیتر نازانم كاك فازیل ئەگەر خۆی قەناعەتی وای هەیە بۆی بۆیەكێكی وەك دكتۆر كەمال و لەنووسنەكانیدا

جەنابتان بە(کەلێنی) دابنێن، پاشان کاک فازیل لەسەرقسەکانی دەڕواو دەڵێ:(گەورەترین کەلێنیش کەلە شێوەی نووسینەکانیدا دەردەکەوێ و پشت بەستنە بەیەك تاقە تیۆری بۆ تێگەیشتنی مێژوو) منیش لەگەڵتام بەڵام دەڤاو دەق(نەء) چونکە نەمن و نەتۆش ناتوانین بڵێین دکتۆر کەمال بێ ئاگایە لە تیۆریەکانی تری بۆیە هەر بڕوای بەو تیۆریانە هەیە کە زیاتر لای بلۆکی سۆشیالیستی جاران واتە یەکێتی سۆڤێت پە پڕەوی دەکرا کاکە لێرەدا زۆرمەبەستی تەواوی خۆتت نەپێکاوە چونکە هەر نووسەرێ هەموو ئەدیبێ و، هەموو مێژوونووسێ کەی و لە کوێ زیاتر لەزمتی ڕووناکبیری بینی ئەوا زیاتر لەگەڵ بارودۆخ و ڕەوشی ڕووناکبیری هەر چوار چێوەیەکی ڕووناکبیریدا تێکەڵ بوو سەیرنەکری بە تەواوی بەوتیۆرو بۆ چوونانە(متأثرە) کە تیایدا پێ گەیشتوە و، هەنگاوی ناوەو تیایدا گەشەی کردووە. پێم خۆشە بۆ ئەمەش من یەك نموونە بهێنمەوە کە لە جەنابتانەوە سەرچاوە ئەگرێ بۆ ئەوەی بە تەواوی هەردوکمان قەناعەت بکەین ئەویش ئەوەیە تۆ واتە(کاك فازیل) زیاتر هەرباسی ئەڵمانیاو دەسەڵاتی ئەڵمان و ڕووناکبیری ئەڵمانو ئەوان ئەکەی تەنانەت حەز ئەکەی زیاتر ئەو سەرچاوانەش بەکاربهێنی. زیاتر بەزمانی ئەڵمانی تۆمار کراون یانی ئەمەش ئەوە ئەسەلمێنێ کە جەنابتان جۆرە شارەزاییو لەزمتێکتان لە ڕووناکبیریو ئەو تیۆرانەوە وەرگرتووە کە زیاتر لە ڕۆژئاواوە سەرچاوەیان گرتووە. دەنا خۆ ئەگەر بێیتەوە لای منیشو باسی مێژوو لێکۆڵینەوەی مێژوویی بکەین. بەردەوام هەر باسی دکتۆر کەمالت بۆ ئەکەم، دیارە ئەمەش ئیسپاتی ئەوە دەکات من بەزۆری سوودم لە نووسینی دکتۆر کەمال و لەدەرسی دکتۆر کەمال وەرگرتووە. بۆیە بەو ڕووحیەتەوە قەرارم ئەگرت

و هەستام وەڵامێكی لەم بابەتەم بۆ ئێوە و بۆ ڕووناكبیرانی كورد نووسی هەرچەندە لەوانەشە لە هەندێ شوێندا سەرچیغ چووبێتم و زۆر حەقیقەتم بەتەواوی نەپێكابێ.

دواتر كاك فازیل بۆ جارێكی دی لە بابەتی مێژووی دكتۆر كەمال لای داوەو، هاتۆتە سەر كتێبێكی تری ناوازەی كە كتێبی (چینی كرێكاری عێراقە) وەكو من بزانم ولە دكتۆر كەمال خۆیشم بیستبێ ئەمە دووەم كتێبە كە لەسەر چینی كرێكاری عێراقی لەوڵاتی عێراقدا بڵاوكرابێتەوە و ، بە شێوازێكی بەرفراوان چ لەلایەن ڕۆژنامەكانی دەرەوەی عێراق و عێراق خۆشیەوە هەڵسەنگێنرابێ و بەرزیان نرخاندبێ. لەگەڵ ئەوەشدا دكتۆر كەمال بەگوێرەی دەرفەت و، بارودۆخی ئەو سەردەمەی كورد، تیشكی خستۆتە سەر چینی كرێكاری كورد. بەڵام خۆ ئێستا نەچووە بچێ و خۆ ناشبێ هەموو بابەتەكان هەر دكتۆر كەمال تەواویان بكا و لەسەریان بنوسێ. دەبا ئەمڕۆ ئێمە باسی ئەوە بكەین كە نووسینێك یا لایەنێك لە مێژووی كۆن و نوێ و هاوچەرخمان دەستی بۆ نەبراوە و یا بە نیوەو نیوەچڵی لەسەر نووسراوە و كەم و كوڕی تیایە با كەسانی تر ئەو ڕەوتە بگرن و ئەو پڕۆژە تەواونەكراوانە تەواو بكەن. هیچ پێویستیش بەوە ناكا كەسمان تەبریری ئەوە بكەین. گوایە سەرچاوە نییە؟ یا حاڵی كورد خراپە؟ یا وەكو كاك فازیل ئەڵێ: دڵسۆزانی كورد هەریەكە و دیلی سەر ئیشەكەی خۆیەتی؟... تاد. بۆ ئەمە قسەیەكی دكتۆر كەمالم دێتەوە یاد بەیانیەكیان ڕۆژنامەیەكی عێراقیم هەڵگرت لەخوێندنی ساڵی (١٩٨٩)دا و وابزانم (القادسیة) بووە. بەرەو كۆلێژی ئاداب- زانكۆی بەغدا بوومەوە كاتێك كە لاپەڕەكانیم هەڵدایەوە سەیر ئەكەم ڕەخنەیەكی كورت لەسەر نووسینێكی دكتۆر كەمال بڵاوكراوەتەوە بەتایبەتی لەسەر بابەتی پێنجەم

لە کتێبی (دراسات في تأريخ ايران الحديث و المعاصر) بوو کە ناونیشانی (حقائق عن المؤسسة الدينية في ايران). کاتێ کە نووسینەکەم خوێندەوە و هەر ئەو ڕۆژە مامۆستا کەمالم لێ ئاگادار کردەوە پێی وتم: حەز ئەکەم ببینم کە ڕۆژنامەکەم دایە. خۆشی خوێندیەوە و یەکسەر وتی: خۆ کاکە من هەر هێندەم پێ کراوە و، ئەوەم لەباردا بووە کە نووسیومە و دەبا یەکێکی تر بێ ئەوەی من تەواوم نەکردووە و بەنیوە و نیوەچڵی لەسەرم نووسیوە با کاکی ڕەخنەگر بێ تەواوی بکا (مەبەستم ڕەخنەگری ناو ڕۆژنامە عێراقیەکەیە اب نووسەر). لێرەدا من وای دەبینم زیاتر بۆچوونەکانی کاك فازیل لەبارەی دکتۆر کەمال و نووسینەکانی دکتۆرەوە وەك جۆرە (حقد)ێك دەردەخەن. ئەگەر وایە ئەوا ڕەنگە من و زۆربەی ڕووناکبیرانی کوردیش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبین. خۆ ئەگەر واش نییە، خۆزگە من بەهەڵەدا چووبم و سەرچیغ چووبێتم و کاك فازیلیش ئەم قسانەی کە ئەیکات و باسیان لێوە ئەکا لەئەنجامی دڵسۆزی و، بەتەنگەوە چوونی بێ بۆ باری ڕووناکبیری کورد و مێژووی نەتەوایەتی کورد. کەوا دەڵێم و پێ داگرتنیشم لەوەوە سەرچاوە دەگرێ. کاك فازیل واز لەوە ناهێنێ و بە بەردەوامی وا(اتهام)ی دکتۆر کەمال ئەکات کە کەسێکی ناشارەزاو بەردەوام خەریکی شێواندنی مێژووی میللەتی کوردە. وەکو لەبەشی دووەمی نووسینەکەیدا ئەڵێ: "د.کەمال هەرچەندە پسپۆڕی مێژووی نوێی گەلی کوردە، لەمەش داخەکەم، لەبەر لاوازی پشتێنەی تیوری کورتی هێناوە. هەر بۆ نموونە ئەو هەر زوو بەهەڵە لە دەوری مێژووی شێخ مەحمودی حەفید تێ گەیشتووە و مێژووی ئەو سەردەمەی بە شێواوی و نازانستی خستۆتە بەرچاو" یا جاری واش هەیە کاك فازیل

دكتۆر كـەمالی بەكەسـێكی ترسـنۆك لەقەڵـەم داوە. گوایـە بەتـەواوی لـە حەقیقەتەكان لای داوە و وە دەڵـێ:"پێـم وایـە لـە گوتنـی زۆر ڕاستی خۆی پاراسـتووە" لـە شـوێنی تریشـدا دەبینـی كـاك فـازیل وای بـۆ ئـەچێ كـە سـەركەوتنی مامۆستا لـە نووسـینەكانی دا بەڕێكەوتـە وەك دەڵـێ:"مێـژوو نووس كونیپتی تەواوی بێ كون و كەلەبەری بۆ مێـژوو نیـە و سەركەوتنی لـەكارێكدا بەڕێكەوتـەوە بـەندە" بەڕاستی باسكردنی وا، هەڵسـەنگاندنی وا گەڵێ زەحمەتە و ئەگەر خوێنەری وشیار و ڕووناكبیری مەوزوعی، ئەوانـەی كاك فـازیل بخوێنێتـەوە. مەگـەر هـەر زۆر زۆر بـێ ویـژدان بـێ بـڕوا بكـا. چونكە بەڕاستی مەسـەلەی ڕێكەوت لە ژیـانی ئینسان و لــە هـەنگاونانی ئینساندا ڕەنگە هەر جارێ یان دووجار ڕوویدا. بەڵام قەت نەبوە و نەكراوە بۆ كەسێك هەر ئیشێ بكا و بەتـەواوی و بەئەمانەتـەوە جێ بـەجێی بكـاو هەر هەمووی ڕێكەوت بێ. تـۆ بڵێـی سـەركەوتوویی دكتـۆر كـەمال و دانـانی ئەو هەموو كتێب و وەرگرتنی ئەو هـەموو بڕوانامـە و بڵاوكردنـەوەی ئـەو سـەدان لێكۆڵینـەوە جۆر بـەجۆر و نووسـینانە هـەر هـەمووی بەڕێكـەوت بووبێت(؟!). من ئـەم پرسـیارە ڕووبەڕووی كـاك فـازیل خـۆی دەكەمـەوە و هەر خۆشی ئەگەر وەڵامێكی هەیە بالـە داهاتوودا بۆمـانی ڕوون بكاتـەوە. لەسـەرەتای بەشـی سـێیەمی ووتارەكـەی (كوردسـتانی نـوێ)ەوە كـاك فـازیل هاتۆتــە ســەر باســكردنی(بەرهــەمی بەكۆمــەڵ و بەرهــەمی تــاك)و وتوویەتی:"ئەم كارەی د.كەمال پـێی هەڵساوە. گـەر چـەند مێژوونووسێك پـێی هەڵسابان، ڕەنگە كەم و كوڕی كەمتر با" بـۆ قسەكەی كاك فـازیل مـن نــاڵێم جگـە لـە دكتـۆر كـەمال مەزهـەر مێـژوو نووسـی تـری بـەتواناو بەتەجروبەمان نـیيە؟ هەر ئەوە دەڵێم باشە ئەو مێژوو نووسـانەی كورد و ئەوانەی كە زۆر خۆیـان بۆ ساغ كردنـەوەی كورد و شوناسـنامەی میللـەتی

کورد تەرخان کردووە کامانەن؟ ئایا ژمارەیان بەقەد پەنجەکانی دەس ئەبن. بە تایبەتی لەو ماوەیەدا کە دکتۆر کەمال خەریکی دانانی ئەم کتێبە بەنرخەی بووە. یا کەی مەسەلەی پەیوەندی کردنو سەرچاوە و زانینی زمان بۆ ڕووناکبیرانی کورد ئاسان و مەیسەر بووە تا بتوانن هەر هەموویان پێکەوە دەس بدەنە کارێکی هەرەوەزی یا کەی پەتای (دەردەکورد) دکتۆر کەمال واتەنی هێشتوویەتی تەنها دوو ڕووناکبیری کورد دانوویان پێکەوە بکوڵێ و پێکەوە بارێکی لاسەنگ بۆ گەلی کورد سەنگ بکەنەوە. جا خۆ سەیری ئەم لایەنە بکەی لە ئێستا کوردستانی ئازادا(!) ئەوە خەم و پەتاکە زیاتر تەشەنەی کردوە و ڕۆژ بە ڕۆژ باری ڕووناکبیریی و مێژووی میللەتەکەمان بەرەو هەورازتر دەڕوات. کاکە چی (تصور) ئەکەی بە ڕۆژی نیوەڕۆ بەبەرچاوی هەموو خەڵکەوە مامۆستای زانکۆی (صلاح الدین) و پیاوی ڕووناکبیری کورد (صلاح هەورامی) دەدرێتە بەر ڕێژنەی گوللە و کەسیش نییە خۆی بکاتە خاوەن. خۆ هەر لەسەردەمی بەعسیشدا وا ڕەقابە و چاودێری خرابووە سەر ڕووناکبیرە دڵسۆزەکانی کورد. ئەبوایە بەسەد قوربان و ساقە تا بابەتێکیان بڵاوئەکرایەوە دەیان جار کلك و گوێ ئەکران و چەندین نیشتمان فرۆشی کورد و ئەڵقە لەگوێی کورد دەستی خۆی ئەگەیانێ. خوانەخواستە خۆ من نالێم کاری بەکۆمەڵ کردن و هەرەوەزی خراپە و وامان لێ ناکا کە نێڵەیەکی زیاتر بداتە کاری ڕووناکبیریمان. بەڵام مەسەلەی بەراورد کردن لەنێوان عێراق یا کوردستان و ئەوروپا ئاسمان و ڕێسمانە. ئەگەر دوو کەسایەتی کوردیش بۆ مەسەلەیەك چەند جارێك کۆبووبونایەتەوە بەتایبەتی لەو دەمانەدا ئەوا دەیان حەق و حیسابیان بۆ دەکرا وا بزانم خۆشتان لەگەڵ هەمان واقیعدا ژیاون و پێویست بە دەلیل و ئیسپات بوون ناکا. لە کاتێکدا کاك فازیل

باسی ئەوە ئەكا كە دكتۆر كەمال بەتەواوی حەقی مێژوو نووسان و ڕووناكبیرانی بەنەژاد كوردی وەك: "الدینوری، ابن المستوفی، ابن الاثیر، ابن الخلكان...هتد"ی نەداوە: "كە دكتۆر كەمال دەیتوانی بە شێوەی سوود وەرگرتن لەم بەرهەمانەوە دەستنیشان كات" یا پێشتر وتوویەتی: "لەوە دەچێ د.كەمال ئەو كتێبانەی باسیان دەكات. زۆربەیانی نەخوێندبێتەوە" بۆ ئەم قسانە هەق وایە كەسێكی ڕووناكبیر بەو پێوەرە بیر بكاتەوە كە دكتۆر كەمال نەهاتوە (عرض)ی كتێب بكا و هەموو لایەن و چەند و چوونێكی ساغ بكاتەوە. بەڵكو من وای بۆ ئەچم ئەگەر ئەوەی كردبا ڕەنگە هەر نووسینێكی یەكێك لەوانەی كە تۆ ناوت بردوون پێویستی بەدانانی یەك كتێبی وەك (مێژوو) هەبێ. بەڵكو لێرەدا مەسەلەی دكتۆر كەمال و بۆچوونی دكتۆر كەمال لە كتێبی مێژوودا هەنگاو نانە بەرەو دانان و لێكۆڵینەوە كردن لە بابەتێكی زانستی سەربەخۆ كە لە چوارچێوەی (مێژوو)دا گەڵاڵە بووە. خۆ ئەگەر ناوی كەسێك یا كتێبێك یان نووسراوێكی لەبیر كردبێت یا تۆماركردبێ بە ئەنقەست ئەوەی نەكردووە. وەكو خۆشی لە پێشەكی مێژوودا دەڵێ: "دەشمەوێ بە ڕووناكبیرانمان بڵێم ون بوون بۆ خزمەت و چاكەی كەس نییە. دەمویست لەو بەشەدا هەر كەس دەنكە جۆیەكیماڵی پاشای خواردووە ناوی بهێنمەوە. بەڵام ترسام ئەوە كار بكاتە سەر ناوەڕۆكی گشتیی كتێبەكە. ئەوەندە هەیە ناوی كەسم بەئەنقەست نەخستۆتە پشت گوێ". هەر لەوانەشدا كاك فازیل باشی بۆچووە و زۆر ڕاست ئەكا كە دكتۆر كەمال ناوی زۆر دەسنووس و كتێبی نایابی لەبیركردووە و، لە مێژوودا ناویانی تۆمار نەكردووە. بەڵام لە هەمانكاتا ئەمانە بەكەم و كوڕی دانانرێت. بەڵكو ئەم كارەی دكتۆر كەمال

لێکۆڵینەوەی تری بەدوادا دێ. کەسی تر بۆی هەیە ئەوانەی دکتۆر کەمال تەواوی نەکردوون تەواویان بکا، نامەخانەی کوردیو باری ڕووناکبیری کوردی پێ دەوڵەمەند بکا. بۆ نموونە کتێبێکی ناوازەی وەك (تأریخ الفارقی) کەسەرچاوەیەکی گەلێك بایەخدارە و ئەبوایە مامۆستا ناوی ببردایە، بەڵام کە بابەتێکی لەبیرچووبێت یا تۆمار نەکرابێت بە قەستی و (عمدا) نەبووە. هەرچەندە دکتۆر کەمال پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکە بەو مەسەلەیەی زانیووە و زۆر بابەت و نووسراوو کتێبی تریشی لەبیر کردوە و هەر لەو کاتەشەوە خەریکی کۆکردنەوە و تۆمارکردنیان بوو تەنانەت ئەم (تأریخ الفارقی)یەی کە کاك فازیل ئەڵێ من خۆم لەکۆتایی ساڵی خوێندنی (١٩٩١-١٩٩٢) بەدیاری دام بە دکتۆر کەمال. ئیدی لەو کاتەوە دکتۆرم نەدیوەتەوە. سەبارەت بەو هەموو کتێب و نووسراوو بڵاوکراوانەش کە جەنابتان لەبەشی سێیەمدا ئاماژەتان بۆ کردووە دەلیلی ئەوەن کە میللەتی کوردو باری ڕووناکبیریی کورد هەر لەو نووسین و تۆمار کراوانەدا ڕەنگ نادەنەوە کە تەنها دکتۆر کەمال تۆماری کردبێ لە کتێبی مێژوودا. یا ئەوانەی جەنابتان بەتەواوی تەواوکەری ئەوانەی دکتۆر کەمال نین. چونکە ئێمەی کورد تا ئێستا لە قۆناغێکی هەرە سەرەتاییداین بۆ کۆکردنەوەی ئەو نووسراوو دۆکیۆمێنت و سەرچاوانەی لەبارەی کورد و مێژووی گەلی کوردەوە تۆمار کراون. خۆ ئەگەر ئەمڕۆ نامەخانەیەکی سەرتاسەری هەبوایە لە شوێن و جێگایەکی تایبەتیدا و چەند کەسێکی دڵسۆز خەریکی فۆتۆکردن و وێنەگرتن و کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوە و نووسراوانە بونایە لەو نامەخانەیەدا بیان پاراستایە و سودیان لێ وەرگرتبایە بێگومان نێڵەیەکی ئێجگار گەورەی دەدایە زیندوو کردنەوەی کەلەپوور و مێژووی

لێك دانەبڕاوی گەلەكەمان و زیاتر شوناسنامەی نەتەوایەتیو بیری نەتەوایەتیمانی دەوڵەمەند دەكرد. من هەر لێرەوە لەپەنای ئەم وەڵام دانەوەی كاك (فازیل)ەوە ئەوە دەخەمە پێش چاوی حكومەتی هەرێمی كوردستان (بەهەردوو بەشەكەیەوە) لەكوردستانی باشوردا. كە هەوڵێكی جیدی لەو بابەتە بدرێ بۆ ئەوەی چی تر باری ڕووناكبیری و ڕەوتی مێژوومان بەو جۆرە پەڕەوازە و سەرگەردان نەبێ. خۆ ئەگەر ئەم هەنگاوە ڕۆژێ زووتر بنرێ. ئەوا هەنگاوێكی دڵخۆشكەر دەبێ و گەرمووگوڕیەكی زیاتر ئەداتە خەبات و ئەو هەوڵ و تەقەللاكردنەمان كە ساڵەهای ساڵە قوربانی بۆ دەدەین و ڕۆڵەی كوردی لەپێناودا ئەكەینە قوربان لە لایەكی كەشەوە قەت بە گونجاوی نازانم كەسێكی ڕووناكبیر بەیەكێكی وەك دكتۆر كەمال بڵێ: "ئەگەر بهاتایە هاریكاری لەگەڵ مێژوو نووسانی تردا بكردایە. ناچار نەدەبوو مێژوو پڕ لە ڕستەی بێ سەروبەر بكات. هەق بوو ئەو دووسێ دێڕەی لەسەر مێژووی كەم زانراوی دونبوڵیەكان بنوسیبایە" وتویەتی: "لەوە دڵنیام د.كەمال هەر نازانێ دونبوڵیەكان چین و كەوتوونەتە كوێوە". بەڕاستی من ئەم هەموو قسانە هەروەكو بۆچوونەكانی كاك فازیل خۆی كە دەڵێ: "هەر بەبێ سەروبەر ئەزانم"و بە حوكم دانێكی ناشەرعی دادەنێم. ئیتر ئەگەر كەسێكی وەك دكتۆر كەمال هیچ لە بارەی (دنبوڵی)یەوە بزانێ یان نەزانێ هیچ لە ئیعتبار و زانایی و دانایی و لێ هاتوویی ئەو زانا گەورەیەی كورد كەم ناكاتەوە لە كاتێكدا پێی بكرێ ڕۆژانە خۆی ئەكا بەكونی دەرزیا، بەو مەرجەی بارێكی لاسەنگ بۆ كورد و مێژووی كوردو سەروەری كورد سەنگ بكاتەوە و ئاستی مێژوو نووسی كورد بگەیەنێتە چڵەپۆپە و ڕادەیەك كە كوردیش وەك میللەتێكی زیندوو خاوەن مێژوو بناسرێ. نەوەك حوكم دانێك. كەسێك دەسبكاتە

گیرفانی خۆیا و لەبەرچاوی هەموو ڕووناکبیرانی کورد (عرض)ی بکا و خۆی پێ هەڵکێشێ(!!) یاخود وەك دەبینی کاك فازیل باسی ئەو دوودڵیەی دکتۆر ئەکا لەبارەی میدیەکان و نەژای میدیەکانەوە کە تائێستا شتێکی ئەوتۆیان لەبارەوە ڕوون نەبۆتەوەو کاك فازیل وا وەڵامی دکتۆر کەمال ئەداتەوە و ئەڵێ: "یادەبا دکتۆر کەمال میدیەکانی بەباپیرەگەورەی کورد دانایە و نوقتەیەکی لەکۆتایی ڕستەکە دانایە. یا هەر توخنی باسەکە نەکەوتایە" بڕوات هەبێ منیش زۆر دڵنیام لەوەی کە دکتۆر ئەو دووسێ دێڕەشی نەنووسیبایە ئەوا بێگومان جەنابتان دەتان گوت دکتۆر کەمال باسی میدیەکانی باپیرە گەورەی کوردانی نەکردووە. هەرچەندە دکتۆر کەمال زۆر لەمێژترە بەو باس و بابەتەوە قاڵە و تەنانەت لەساڵی ١٩٧٣دا نووسینێکی ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی مینۆرسکی وەرگێڕاوە بە ناونیشانی (الأكراد احفاد الميدين) واتە (کوردان نەوەی میدیەکانن). پێم خۆش نییە و ڕەنگە نووسینەکەشم پڕ بێت لە قسەی (بێ سەروبەر) بۆیە حەز ناکەم زیاتر پێ داگرم و لەسەر ئەم بابەتە بڕۆم هەر چەندە دڵنیام لەوەی کە زیاتر هەڵ دەگرێ و پێویستە زیاتر بۆچوونەکانی کاك فازیل تاوو توێ بکرێت وەك دەڵێ: "ئەو نێوی چەندین کتێبی هێناوە کە فریان بەسەر مێژووی کوردەوە نیە بەڵکو وەکو کتێبەکانی کیم ئیل سونگ، سیفال، ماوتسی‌تۆنگ، ژان ژاك ڕۆسۆ...تاد" بۆ ئەمەشیان وەڵامی من ئەوەیە نە کتێبەکەی دکتۆر کەمال تەنها پابەندە بەمێژووی کوردەوە وەك لە ناونیشانەکەیدا نووسیویە (مێژوو کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو) ئیتر بۆ نابێ ناوی کتێبی وا بهێنێ. پاشان ناوی ئەو کتێبانەی هێناوە یا ئەو نووسراوانەی هێناوە کەوەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی کوردی

لەوانە و بۆ زیاتر ئاگادار بوونی جەنابتان و هەموو خوێنەرێکی بەڕێز وەك نموونە ئاماژەیان بۆ دەکەم:-

١-سیفال، چەند تیئورێکی زانیاری، مچە لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی، بەغدا ١٩٦٠، ٤٨ل.

٢-ژان ژاك ڕۆسۆ، (گەلاوێژ)، ژمارە (٧)، تەموزی ١٩٤٤، ل١٢-١٦.

٣-کیم ئیل سونگ، دەربارەی بیروباوەڕی زوچە، بەغدا١٩٧٣، لەبڵاوکراوەکانی (کتێبخانەی بیری نوێ)یە، پێم وایە دارای شێخ نوری (دارۆ) لە عەرەبییەوە کردویە بە کوردی.

٤-ماوتسی تۆنگ، چارەکردنی ناکۆکیەکانی ناو گەل، سلێمانی ١٩٦٠، ل٩٠، محەمەدی مەلا کەریم لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی.

ئەمانەی کە ناوم بردن تەنها وەکو نموونە هێناومەتەوە ئەگەر نووسراو گەلێکی لەم بابەتانە و بەو جۆرە کە چەن ڕووناکبیرێکی کورد کردبێتیان بەکوردی بۆ دکتۆر کەمال مافی ئەوەی نەبێ باسیان لێوە بکا و ناویان بهێنێ. لێرەدا بەدواوە زیاتر لەسەر ئەم نووسین و وەڵام دانەوە ناڕۆم و درێژدادڕیشم پێ جوان نییە. هیوادارشیم هەر شتێکم بەسەرا تێپەڕیبێ یا لەبیرم کردبێ. ڕووناکبیرێکی تر و بەگیانێکی مەوزوعی خاوێنەوە بتوانێ کەلێنەکانی دی پڕبکاتەوە. بەم وتانەشم نە قسەکانم، نەقەڵەمەکەم کەس زامار ناکەن بەو ئاواتەی کاك فازیل بە ڕۆحیەتێکی برایانەوە بیان خوێنێتەوە. هەرچییەکی تریش مابێ لە توێی نانێکی گەرما ئەی هێڵمەوە. چونکە حوکمی ڕەوای مێژوو گەلێ... گەلێ لەوە سەختتر و گرنگترە کە هەندێ کەس بیری لێ دەکەنەوە.

کەلار

کۆتایی ئایاری ١٩٩٥

٭ئەم نووسینە وەڵامێکە بۆ نووسینێکی برای ڕووناکبیر (فازیل کەریم) کە کاتی خۆی لە (کوردستانی نوێ) ژمارەکانی (٩٧٨)، (٩٧٩)و (٩٨١)یدا بڵاوی کردەوە سەبارەت بە کتێبی (مێژوو)ی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد. منیش دووبەشم لە ڕۆژنامەی (ئەمڕۆ) ژمارەکانی (١٦)و (١٧)یدا بڵاو کردەوە بەڵام بەهۆی داخستنی ڕۆژنامەکەوە بەشەکانی تری بەدوادانەهات. هەر بۆیە لێرەدا و بێ دەستکاری بڵاوی دەکەمەوە. هەرچەندە. هەندێ بۆچوون و سەرنجی تیایە تەنها بۆ ئەو کاتە واتە (١٩٩٥) و ئەو دەمە دەگونجێ. هاوکات بڵاوکردنەوەی (وەکو خۆی) بەپێویست دەزانم (اـب نووسەر).

## ناوەڕۆك

## کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر

١-کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردیەکان لەساڵانی ئینتیدابی بەریتانیادا ١٩٢٠-١٩٣٢، سلێمانی ١٩٩٨.

٢-ئۆزدەمیر و کورد، کورتەیەك لەمێژووی ململانێی بەریتانیا و تورك لە کوردستانی باشور، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری سلێمانی ٢٠٠٠.

٣-جوولەکەکانی کوردستان، بنەچەیان، داب و نەریتیان، هۆی کۆچکردنیان، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٠.

٤-شاعیری جوانەمەرگ فەریق ئەمین و دەنگی ڕەسەنی شیعر، بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ، سلێمانی ٢٠٠٠.

٥-گوڵە پەپوولەییەکانی کەناری سیروان، بڵاوکراوەکانی لانەی منداڵانی کوردستان، سلێمانی ٢٠٠٠.

٦-چارەنووسی گەلی کورد لە کۆنگرە و ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان، بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٢.

٧-شاعیری شەهید محەمەد پەژار، بڵاوکراوەکانی دەزگای بەدرخان سلێمانی ٢٠٠٣.

٨- دیاری کوردستان لاپەڕەیەکی پرشنگدارە لە مێژووی ڕۆژنامە نووسی کوردیدا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٤.

٩- کۆمەڵی یانەی سەرکەوتن، بڵاوکراوەکانی شارەوانی کەلار، سلێمانی ٢٠٠٤.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەمساڵی ٢٠٠٤

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
| --- | --- | --- |
| ٢٤٨- مانگی نیوەڕۆ | دڵشاد عەبدوڵڵا | |
| ٢٤٩- گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ... | عەتا قەرەداخی | |
| ٢٥٠- پەیڤەکانی ڕەنگ | وەهبی ڕەسوڵ | |
| ٢٥١- گۆڕستانی چراکان | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢٥٢- چوار شانۆنامە | | هەورامان وریا قانیع |
| ٢٥٣- دەربارەی ئەقڵی مۆدێرن | | ئازاد بەرزنجی |
| ٢٥٤- دوا گفتوگۆکانی بورخیس | ئا: ئوسفالدو فراری | ڕەووف بێگەرد |
| ٢٥٥- چاخی زانیاری | ئازاد حەمە | |
| ٢٥٦- فەرهەنگی هەندەران | حەمەی ئەحمەد ڕەسوڵ | |
| ٢٥٧- خەیاڵی زمان | عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا | |
| ٢٥٨- بینای کات لە سێ نموونەی ڕۆمانی کوردیدا | نەجم خالید نەجمەددین | |
| ٢٥٩- بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا | سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی | |
| ٢٦٠- ڕشتەی مرواری | عەلائەدین سەجادی | |
| ٢٦١- باخچەیەك لە شیعری .... | | د. فەرهاد پیربال |
| ٢٦٢- کێوی پێنجەم | پاولۆ کۆیلۆ | یاسین عومەر |
| ٢٦٣- جەنگی چوارەمی جیهانی | کانت دمارانش | دلاوەر عەبدوڵڵا |
| ٢٦٤- پزیشکی میللی | د.جی.سی.جارفیش | تۆفیق سەعید محەمە |
| ٢٦٥- خەونی جەللاد | ئاراس عەبدولکەریم | |
| ٢٦٦-ئێوە بە خۆشەویستیم ئەسپێرن | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢٦٧-کوردو کۆمەڵی مەدەنی | کەیوان ئازاد ئەنوەر | |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦٨-شەرەفنامە | مهاباد قەرەداغی | |
| ٢٦٩-پۆلێنکردنی پەیژەکانی موزیکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست | سەلاح ڕەئووف | |
| ٢٧٠-ڕێگوزەری بیری سیاسی | سڤێن- ئێرك لیدمان | ئاسۆس کەمال |
| ٢٧١-دۆزی کورد | د. جویس بلۆ | کارزان محەمەد |
| ٢٧٢-بوون و داهێنان | د.محەمەد کەمال | |
| ٢٧٣-وتار و لێکۆڵینەوە | فوئاد تاهیر سادق | |
| ٢٧٤-مەهاباد لە ئۆلۆمپیادەکانی خوادا | سەلیم بەرەکات | هەندرێن |
| ٢٧٥-دەستی خودا | ڕەووف بێگەرد | |
| ٢٧٦-ئەو باڵندە بریندارە کە منم | عەتا نەهایی | |
| ٢٧٧-ئەفسانەی لوڕی | داریوش ڕەحمانیان | عەزیز گەردی |
| ٢٧٨- ڕاگوێزانی کورد لە مێژوودا | عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی) | |

نرخی (١٨٠٠) دینار